

# گۆڤاری کۆمپیوتەر

ژمارە ١٨



( تشرینی دووەم ) ی ٢٠٠٦

گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بەبواری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت ـ وەزارەتی ڕۆشنبیری دەری دەکات

www.compmagz.com

- وەزارەتی وەرزش و لاوان و هەنگاونان بەرەو وەزارەتێکی ئەلکترۆنی






- چۆنێتی بەکارهێنانی ئەنتەرنێت لە ڕێگای مۆبایلەوە



- چۆنێتی درووست کردنی ژوورێکی تایبەتی لە پاڵتۆك



- دابەزاندنی قورئانی پیرۆز بۆ ناو بەرنامەی وۆرد



- تۆڕێکی ئەلکترۆنی بۆ گێڕاندنەوەی بینین



- یاری فڕۆکەی جەنگی



# گۆڤاری کۆمپیوتەر

ژمارە ١٨

تشرینی دووەمی ٢٠٠٦

**گۆڤارێکی مانگانەی تایبەتە بەبواری کۆمپیوتەرو ئینتەرنێت ـ وەزارەتی ڕۆشنبیری دەری دەکات**


**تێبینی : هەموو پەیوەندیەکان لەڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت**


**ناونیشان:**

هەرێمی کوردستـــــــان/ عێراق ـ هەولێر . بەرامبەر دەرگای قەڵا باڵەخانەی قەیسەری حاجی یەحیا

نهۆمی دووەم شوێنی مەلبەندی کۆمپیوتەری ئاراس ی کۆن بۆ هەر پێشنیـــــار و سەرنجێـــــک

یان ناردنی بابەتێـــــک .پەیوەندی بکـــــەن بەسەرنووسەرەوە بەم ناو نیشانە :

دیوانی وەزارەتی ڕۆشنبیری ـ بەڕێوەبەرایەتی کۆمپیوتەر ـ یان ناونیشانی سەرەوە .

یان بە ژمارە تەلەفۆنی نووسینگەی گۆڤار : **2527054** یان مۆبایلی سەرنووسەر **07504618045**

**یان پۆستی ئەلکترۆنی :**

**E.mail: computer_magazine_2005@yahoo.com**

**aras_co_center@yahoo.com**






**تێبینی :**

بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی کە بابەت ئەنێرن بۆ گۆڤاری کۆمپیوتەر تکایە ڕەچاوی ڕێسای نووسین بکەن لەسەر کۆمپیوتەر بەدانانی خاڵبەندی نووسین بەم شێوەیەی لای خوارەوە

1. لە پێش فاریـزە، هیـــچ Spase نەبێت لە دوای فاریـزەش بـا یەک Spase هەبێت.
2. لە پێشخـــاڵ. هیچ Spase نەبێت لـــە دوای خاڵیـــش بـــا دوو Spase هەبێـــت.
3. ئەو بەڕێزانەی کە بابەتـــی وەرگێڕان ئەنێـــرن با ئاماژە بە سەرچـــاوەکەی بکـــەن.


**سەرپەرشتی چاپ**

**ئەهرۆ مەحمود**

چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

# پێرســـــت





# ناوەڕۆکی سیدی ژمارە ١٨

ئا : هێرش ئسماعیل

بـــەشی کتێبی فێرکاری :

زیاتر لە (( ٣٠ )) کتێبی بە نرخی جۆراو جۆری تایبەت بە سیستەم و بەرنامەکانی ئامێری کۆمپیوتەر کە بە زمانی عەرەبی نووسراون .

| بەرنامەکانی دژە ڤایرۆس | کاری بەرنامەکە |
|---|---|
| AVG 7.0.197 Pro | دژە ڤایرۆس |
| Norton Antivirus Pro | دژە ڤایرۆس |

| بەرنامەکانی ئەنتەرنێت | کاری بەرنامەکە |
|---|---|
| hotmail options | تایبەتمەندیەکانی ماڵپەری هۆتمایل |
| MASS DOWNLOADER 2.6 | تایبەت بە دابەزاندی بەرنامە لە ئەنتەرنێتەوە |
| Microsoft Internet Explorer 6.0FULL | تایبەت بە نیشاندانی ماڵپەرەکانی ئەنتەرنێت |
| MSN MESSENGER 5 | تایبەت بە چات و گفت و گۆ |
| MSN6 | تایبەت بە چات و گفت و گۆ |
| window washer 5 | تایبەت بە خاوێن کردنەوەی هارد دیسك لە پاشماوەی فایلە زیادەکان |

| بەرنامەکانی فۆتۆ | کاری بەرنامەکە |
|---|---|
| ACD See 5.0 Full Arabic | تایبەت بە نیشاندانی وێنە |
| Adobe Acrobat Reader 5.05 | تایبەت بە خوێندنەوەی کتێبە ئەلکترۆنیەکان |
| Adobe Photoshop 7.0ME | تایبەت بە دەستکاری کردنی وێنە |
| CompuPic Pro 6.21 | تایبەت بە جوانکاری وێنە |
| Glanda | تایبەت بە درووست کردنی جوڵە لەسەر وێنە |
| photo2vcdpro 1.82 | تایبەت بە درووست کردنی ئەلبومی ڤیدیۆ سیدی لە کۆمەڵێك وێنە |
| . Real Draw | تایبەت بە وێنە |
| Video Studio 7.0 | تایبەت بە دەست کاری کردنی وێنە و ڤیدیۆ و دانانی جوڵە |
| Video To Flash Arabic | تایبەت بە گۆواستنەوە فایلی جۆری ڤیدیۆ بۆ جۆری فلاش |

| بەرنامە ئاینیەکان | کاری بەرنامەکە |
|---|---|
| ATHAN | بەرنامەی بانگدان |
| ATHKAR | بەرنامەی زیکرەکان |
| KENZ M | بەرنامەی پێشبرکی |
| MAKKA | بەرنامەی پێشبرکی |
| MOSABKH | بەرنامەی پێشبرکی |
| MOUSHAF ALNOUR M | قورئانی پیرۆز بە شێوەی بەرنامە |
| QALOON | تایبەت بە گەڕان لە ناو قورئانی پیرۆز |
| TAFSIR A | تەفسیری خەونەکان |

| بەرنامە هەمەڕەنگەکان | کاری بەرنامەکە |
|---|---|
| Add Remove Pro v2.03 | تایبەت بە سرینەوەی ئەو بەرنامانەی کە ناسردرێنەوە |
| Clone cd 4.2.0.2 | تایبەت بە کۆپی کردنی سیدی |
| DB power AMP | تایبەت بە گۆڕینی جۆری فۆرماتەکانی دەنگ |
| DirectX 9 | تایبەت بە خێراکردنی یاری |
| Flash Player 6.0 | تایبەت بە نیشاندانی فایلی جۆری فلاش |
| Jet Audio 5 Plus | تایبەت بە بەکارهێنان فایلە دەنگیەکان و گۆڕینی جۆری فۆرماتەکانیان |
| Nero 6 | تایبەت بە کۆپی کردنی سیدی |
| Quick Time Installer v 6.0 | تایبەت بە بەکارهێنانی فایلە ڤیدیۆیەکان بە تایبەتی جۆری Move |
| RealOne Player v2.0 Gold | تایبەت بە بەکارهێنانی فایلە ڤیدیۆیەکان بە تایبەتی جۆری Rm |
| recover 4all 2.9 | تایبەت بە گەڕاندنەوەی فایلە سڕاوەکانی ناو کۆمپیوتەرەکەت |
| Sound Edit Pro v 1.2 | تایبەت بە گۆڕینی جۆری فۆرماتەکانی دەنگ |
| Super Audio Converter v3.2 | تایبەت بە گۆڕینی جۆری فۆرماتەکانی دەنگ |
| VCDXP | تایبەت بە برینی پارچە ڤیدیۆیەك و وەرگرتنی وێنە لە ڤیدیۆ |
| Windows Media Player 9.0 For Winall | تایبەت بە بەکارهێنانی فایلە ڤیدیۆیەکان و فایلە دەنگیەکان |
| Winzip 9.0 | تایبەت بە کەم کردنەوەی قەبارەی فایلەکان |
| WRAR.320 | تایبەت بە کەم کردنەوەی قەبارەی فایلەکان |

| بەشی یاری | کاری بەرنامەکە |
|---|---|
| BEACH Head | یاری ڕەبایە |
| CHSS 4000 | یاری شەترەنج |
| Million 1 | من سیربح الملیۆن بەشی ١ |
| Million 2 | من سیربح الملیۆن بەشی ٢ |
| Million 3 | من سیربح الملیۆن بەشی ٣ |
| Million 3 | من سیربح الملیۆن بەشی ٤ |
| Waznak Thahab | یاری وزنك ذهب |
| MOORH | یاری قازەکان |

# وەزیری وەرزش و لاوان
# وەزارەتی وەرزش و لاوان هەنگاو بەرەو وەزارەتێکی ئەلکترۆنی دەنێت

**دیمانە : سەرنووسەر**

**لە دیمانەیەکدا لەگەڵ بەڕێز ( تەها بەرواری ) وەزیـری وەرزش و لاوان بـە پێویستمان زانی چەند پرسیارێکی سەبارەت بە بواری کۆمپیوتەرو ئەنتـەر نـێت ئاراستە بکەین هەروەها چۆنیەتی کارکردنیان وپرۆژەکانیان لـە بـواری ( IT ) بەڕێزیشی بەم شێوەیە وەڵامی داینەوە :**



**سەرەتا لەوەڵامی پرسیاری ئایا وەزارەتی وەرزش و لاوان بە نیازن هیچ پرۆژەیەکی تایبەت بە ( IT ) بکەنەوە لەگەڵ دەست بەکاربونی وەزارەت ؟ بەڕێزیان گوتی :-**

بێگومان ئێمە لە یەکەم هەنگاوماندا سایتێکی تایبەت بە وەزارەتمان دامەزراندوە بە ناونیشانی www.mosy-krg.org ئەم سایتە خۆی نیشاندەری ئەوەیە کە ئێمە وەك وەزارەتێکی نوێ دەمانەوێ کارکردنەکەمان بە سیستەمێکی تازە و پێشکەوتوو بێت کە سیستەمی کۆمپیوتەر و IT ئەو سیستەمەش کلیلی چارەسەری زۆر بابەتە کە بەداخەوە لە کوردستان وەك پێویست بەکار نەهاتووە و هۆکاری زۆری هەیە هیوادرام بتوانین ئەو هۆکارانەی کە بوونەتە ڕێگر نەیانهێڵین بۆ ئەوەی کوردستانیش ببێتە ناوەندێك کە (IT ) ڕۆڵی خۆیی تێدا ببینی و بێ جگە ٠لەو سایتەی کە کردومانەتەوە زۆر کاری ترمان بەدەستەوەیە و ئەگەر سەیرێکی سایتەکەشمان بکەیت دەزانن کە وەزارەتی وەرزش و لاوان بەرەو چ ئاقارێك دەڕوات.

**لەوەڵامی پرسیاری ئایا پرۆژەی دامەزراندنی حکومەتی ئەلکترۆنی کە ئێستا لـە زۆربەی وولاتـان پەیڕەو دەکرێت چۆنی دەبینی ئەگەر لە کوردستان ئـەو پرۆژەیـە دابمەزرێ و کاری پێ بکرێ ؟ بەڕێزیان دەڵێت :-**

ئەم پرۆژەیە لە ولآتان شتێکی زۆر باوە ودیاردەیەکی سەردەمیانەیە بەڵام جاریَ ئەو پرۆژەیە لە لای ئێمە کاتی ماوە و دەکرێت بڵێم جاریَ زووە لە بەر بارودۆخی کۆنی عێراق کە ئەو کات تەنانەت بەکار هێنانی کۆمپیوتەریش قەدەغە بوو لە کاتی ڕژێمی بەعسی و ئێستاش گۆڕانکاری لەژێر خانێك بۆ ژێرخانێکی تر بەو خێراییەی ئێمە دەمانەوێ ڕەنگە وا بەئاسانی نەکرێ بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەمە هەنگاوێکی زۆر گرنگە و دەکرێت هەنگاوی بۆ بهاوێژین و ئێمە لە لایەن خۆمانەوە هەوڵ بۆ ئەوە دەدەین کە وەزارەتەکەمان بەرەو وەزارەتێکی ئەلکترۆنی ببەین لەبەر ئەوەی چەند گرفتێك چارەسەر دەکات یەکێك لەوانە پەیوەندی هاولآتی لەگەڵ دەسەلآت هەروەها چاودێری هاولآتی و میدیاکان لەسەر حکومەت زیاد دەبێت خزمەتگوزاری زۆر دەبێت ئاسانکاری لە زۆر ڕووەوە دەکرێت جگە لەمانەش لە ڕووی ئابوریەوە ئەگەر هاولآتیان لە ڕێگایی پەیوەندی ئەلیکترۆنیەوە لەگەڵ وەزارەتەکان پەیوەندی بکەن بۆ خودی هاولآتی بارێکی کەمتری دەبێ و ئاسان تر دەبێ بۆ نموونە لە جیاتی ئەوەی هاولآتی لە شوێنێکی دورەوە بێت بۆ وەزارەتێکی وەکوو وەزارەتەکەی ئێمە یان هەر وەزارەتێکی تر بێگومان ئەو هاتووچۆیە پارەی دەوێ و کاتێکی زۆری دەوێ و چاوەڕوانیەکی زۆری دەوێ بەڵام ئەو کارانە لە حکومەتی ئەلکترۆنیەوە زۆر بە ئاسانی هاولآتی دەتوانێت هەر لە ماڵەکەی خۆیەوە پەیوەندی بە هەر دامەزراوێکەوە بکات کە کاری پێی هەبێت و بێ ئەوەی بچێت بۆ ئەو دامەزراوە ئنجا ئەمەی کە باسم کرد بەشێکی کەمە لە حکومەتی ئەلکترۆنی و زۆر کاری تر هەیە ئەگەر حکومەتی ئەلکترۆنی دابمەزرێت ئاسانکاری دەکرێت هەم بۆ حکومەتەکە و هەم بۆ خەڵکیش و لە زۆر شتیش ڕزگارمان دەبێت.

**لە پرسیارێکی تردا بەڕێزتان دەزانن کە ( IT ) گرنگیەکی زۆری هەیە بۆ هـەموو چین و توێژێك لە کۆمەڵگادا ئایا وەزارەتەکەی ئێوە تا چەند گرنگی دەدا بەم بوارە ؟ بەڕێزیان گووتی :**

گرنگیەکی زۆرمان پێداوە وەکو باسم کرد ئێمە سایتێکمان دامەزراندووە و هەوڵ دەدەین هەموو کارمەندەکانی وەزارەتەکەمان فێری بەکارهێنانی کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت بکەین و پرۆجێکتۆرێکی گەورەمان داناوە بۆ ئەنجام دانی خوولی فێرکردن بۆ کارمەندانمان و هەروەها کەسانی لێهاتوومان لە لایە بۆ ئەنجام دانی زۆر کاری گەورەی وەکوو درووست کردنی داتابەیس و دانانی تۆری ناوەندی و زۆر کاری تریش کە لە داهاتوو دەردەکەون و پێمان خۆشە هاولآتیان لە ڕێگای پۆستی ئەلکترۆنیەوە ناردنی پرۆژە و نووسراومان بە ڕێگای ئیمێڵەوە بۆ بنێرن چونکە بە بێ بەکارهێنانی (IT ) کێشە بۆ خۆیان دروست دەبێت لەوانەیە مەسرەفێکی زیاتر دەکەن چاوەڕوانی زیاتر هەروەها فشارێکی دارایی دەکەوێتە سەریان پێمان باشە لە ڕێگای ئیمێڵەوە پەیوەندی بە ئێمەوە بکرێت ئەو کاتە پێم وایە هاوولآتیانیش هەست بەوە دەکەن کە ئێمە بواری IT و تەکنەلۆژیای کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت بۆ خزمەتی هاوولآتیان بەکار دەهێنین .

**لە دواین پرسیاردا کە ئایا چ پرۆژەیەك یا چ پەیامێکتان هەیە لە بارەی ( IT ) بەڕێزیان ووتی :**

لاوی کورد دەبێت تەنیا بە ناو قسە نەکات لەسەر (IT) بەڵکو دەبێت بە کردار کۆرس ببینن و زیاتر بچنە ناو قووڵایی پرسەکانەوە بە هاوکاری و هەماهەنگی لەگەڵ وەزارەتەکانی تر ئامادەین دەوری خۆمان ببینن ئێمە ئێستا یەکێك لە پرۆژەکانمان دامەزراندنی سەنتەرێکی ئەنتەرنێتە لە شاری هەڵەبجە کە ئەمەش نیشاندەری دەست پێکی کاری ئێمەیە لە کوردستان بە گشتیی و لە شاری هەڵەبجەش بە تایبەتی لە بواری کۆمپیوتەر وئەنتەرنێتەوە ئنجا هیوادارم ئەمە پەخشی سەرتاسەری بێت لە کوردستان وە ئەگەر بودجەی حکومەتی هەرێم تەرخان بکرێت لە ساڵی داهاتوودا بۆ وەزارەتەکەمان ئێمە پرۆژەی ستراتیژی درێژخایەنمان هەیە بە تایبەتی ئەگەر دامەزراندنی حکومەتی ئەلکترۆنی دوا بکەوێت ئێمە وەکو وەزارەتی وەرزش و لاوان هەوڵ دەدەین ببین بە وەزارەتێکی ئەلکترۆنی .

# چی بکرێت بۆ ئـــەوەی بتوانرێ IT
# لە کوردســـــتان ڕۆڵـــیٚ سەرەکی هەبێت لە کارەکانـــدا

ڕیپۆرتاژ و فۆتۆ : ڕێناز ئەردەلان

**بۆ زانیاری زیاتر لەسەر کارکردن لە بواری ( IT ) و گرنگی و سوودی کردنەوەی پرۆژەی تایبەت بە IT بۆ ئەو لاوانەی کە دەرچـووی تـازەی پە یمانگا و کۆلیژەکانن و هەروەها بۆ لاوەکانی کوردستان بە گشتیی بە پێویستمان زانی رووی پرسیار ئاراستەی چەند بەرێزێك بکـەین لـە وەزارەتی وەرزش و لاوان کە ئەوانیش لە وولامدا گوتیان :**



سەرەتا: فاتح فەرەج بەڕێوەبەری یەکەی IT لە وەزارەتی وەرزش و لاوان لە وولامی ئەو پرسیارەدا دەڵێت:

ئەوەی ڕاستی بێت من زۆر قسەم هەیە لەسەر ئەم باسە و بە باشی دەزانم کە ناوە ناوە دەزگاکانی ڕاگەیاندنی کوردی ئاوڕێك لە پێشکەوتنەکانی جیهان بدنـەوە بـە تایبـەتی پێـشکەوتنەکانی بـواری تەکنـەلۆژیای کۆمپیوتـەر و ئەنتەرنێت من لەسەرەتاوە دەمەوێ باسی ئەوە بکەم کە ئێستا هـەموو وولاتە بە هێزەکانی جیهـان کاروبارەکانیـان لـە ڕێگـای IT یـەوە ئـەنجام دەدەن و زۆربەی وولاتانی ئەوروپا و بگرە هەندێك لە وولاتە عەرەبیەکانیش هەنگاو بەرەو حکومەتی ئەلکترۆنی دەنێن چوونکە دامەزراندنی ئەو جۆرە حکومەتە دەبێت هۆی گێرانەوەی زۆر شتی باش بۆ حکومەت لەوانە دوور خستنەوەی دەستی تێرۆر و کەم کردنەوەی گەندەڵی دارایی و خێراکردنی ئەنجامدانی پرۆژەکان و زۆر شتی تریش من بە باشی دەزانم ئەوەی لە توانای ئێمەدا بێت بیکەین بۆ ئەوەی بتوانین کۆمەڵگای کوردی بکەین بە کۆمەڵگایەکی فێرخوازی IT و هەنگاوی ڕاستیش بنێین بۆ ئەو مەبەستە هەر لە ڕێگای کردنەوەی کۆرسی فێربوونی بوارەکانی کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت و بەشەکانی تری IT وەکوو زمانەکانی بەرنامە سازی و سیستەمەکانی کارکردن و بەرنامە گرنگەکان و لە هەموشیان زیاتر بواری ئەنتەرنێت چوونکە لە ڕێگای ئەنتەرنێت و ئیمەیلەوە هاوڵاتیان دەتوانن پەیوەندی بکەن بە دامەزراوەکانەوە دیارە مەبەستم لەو وەزارەتانەیە کە بە نیازن ببن بە وەزارەتی ئەلکترۆنی وەك ئەو هەنگاوەی کە ئێمە بە نیازین بیکەین و هەروەها بۆ کار ئاسانی بەڕێوەبردنی ئیش و کارەکانی هاوڵاتیان و حکومەتیش ئێمە زۆر پرۆژەمان بە دەستەوەیە لەو پرۆژانەش دانانی کۆد بۆ هەر هاوڵاتیەك کە ئەم پرۆژەیە ئێستا لە وولاتی سوید بەکار دەهێنرێت و ئێمە بە هاوکاری بەڕێز وەزیری وەرزش و لاوان کاك تەها بەرواری چەند ساڵێك لەم و بەر بە نیاز بووین ئەو پرۆژەیە بۆ کوردستان بە ئەنجام بگەیێنین بەڵام دەرفەت نەبوو و ئێستا دیسان هەوڵی بۆ دەدەین و هەروەها بۆ کار ئاسانی بەڕێوەچوونی کارەکانی دامەزراوە حکومیەکانیش ئێمە بە نیازین داتا بەیسیکی گەورە بکەینەوە بۆ ئەوەی هەر هاوڵاتیەك کە سەردانی وەزارەتەکەمان بکات ئەوە هەر لە پرسگای وەزارەتەکەمان کۆمپیوتەرێکمان داناوە بە هەموو پاشکۆکانیەوە مەبەستم ئامێری وێنەگرتنی ڕاستەوخۆیە ئەو هاوڵاتیە وێنە و ناوی تەواوی لەگەڵ مەبەستی سەردانەکەی لە داتا بەیسی ناو کۆمپیوتەرەکەدا تۆمار دەبێت لەو بەروارەی کە سەردانی وەزارەتەکەی ئێمەی کردووە ئنجا هەروەها بێتەوە زۆر کاری تریشمان بە دەستەوەیە ئەگەر کات و میزانیەی دارایی تەواومان هەبێت ئەنجامی دەدەین لەوانە کردنەوەی کۆرسی فێربوونی کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێت بۆ هاوڵاتیان بە خۆڕایی دیارە ئەوەی کە باسی دەکەم گرنگی دانە بە هاوکاری کردنی لاوەکان لە کوردستان و هەروەها بەرز کردنەوەی ئاستی IT یشە لە کۆمەڵگای کوردیدا و ئێمە ئەزموونمان هەیە لەو بوارەدا و کاری بۆ دەکەین بەو هیوایەین بە هاوکاری حکومەت و ئێوەش بتوانین لەو کارەدا سەرکەوتووبین و لەگەڵ خۆشمان زۆر ئامێری بە نرخمان هێناوەتەوە لەوانە سکرینی وایەر لێس کە بۆ زۆر کار بەکار دێت و هەروەها ئامێری جۆری بەستنەوەی تۆڕی ناوەندی درێژ خایەنی وایەر لیسی بە هێزمان هێناوەتەوە کە دەتوانین بۆ خۆشمان و بۆ وەزارەتەکانی

تریشی دابنێن و زۆر هـەنگاوی ترمان نـاوە لـەو هەنگاوانـەش کردنـەوەی ماڵپـەڕێکی بە هێـزی تایبـەت بـە وەزارەتەکـەمان کـە ناونیشانەکەی لەسەرەوە ئاماژەی پێ کراوە و دەشتوانین پۆستی ئەلکترۆنی بدەین بە هەموو کارمەندێکی خۆمان لـەو ماڵپـەڕەدا بە خۆڕایی .



**نالین ئەکاد :-بەرپرسی پرۆژەکـان لـە وەزارەتـی وەرزش و لاوان لـە وەڵامـی ئـەو پرسیارەدا دەڵێت :**

ئێمـە لـە سـەرەتادا دەبێـت هـەنگاو بـۆ ئـەوە بنێـن کـە چـۆن و بـە چ شـێوازێك لاوەکانمان فێری بەکارهێنانی شتە سەرەکیەکانی کۆمپیوتـەر بکـەین ئنجا ئەو فێربوونـەش چ لـە ڕێگـای کـۆرس بێـت یـان کتێبی فێرکـاری بێـت یـان سیدی فێرکاری یانیش گۆڤار و بەرنامەی تایبەت بە کۆمپیوتەر لە تەلەفزیۆن بەم چەند شێوازە دەبێت هەوڵ بدەین کە لاوەکان فێری بەکار هێنانی کۆمپیوتـەر بکـەین و دواتر دەبێت هەنگاوی گەورەتر بنێن مەبەستمان لە هـەنگاوی گـەورەتر ئەوەیـە کە بتوانین لـە چـەند شوێنێکی سـەرەکی لـە شـار و شارۆچکەکانی کوردستان سـەنتەری تایبـەت بـە کۆمپیوتـەر و ئەنتەرنێت بکەینەوە و هەروەها گروپی IT درووست بکەین بۆ ئەوەی بتوانین لە ڕێگای ئەو گروپانەوە بەرنامە سازی بکەین و داتا بـەیس و بەرنامە بە شێوە زاری خۆمان درووست بکەین ئنجا ئەو کات دەتوانین بڵێین ئایتی ڕۆڵی سەرەکی دەبێت لـە کوردستان چوونکە ئێستا کاری زۆری دەوێت بۆ درووست کردنی ئەو جۆرە پرۆژانە بۆیە ئێمە لە دەستپێکەوە هەوڵمانداوە کە ئەو کارە بکـەین و لـە سـەرەتاوە لـە شـاری هەڵەبجـەی شـەهیدەوە لـە هـەوڵی درووسـت کردنـی سـەنتەرێکی ئەنتـەرنێتین لـەو شارۆچکەیە بـۆ ئـەوەی لاوەکانی ئـەو شـارە لـەو سـەنتەرە فێـری بەکار هێنـانی ئەنتـەرنێت بـن و خـۆیـان و پەیامەکانیان بـە جیهـانی دەرەوە بگـەیێنن و شارەزای کلتوری وولاتانی جیهانیش بن و هەروەها دەتوانن لە ڕێگای ئەنتەرنێتەوە دۆستایەتی بکەن لەگەڵ هەر لایەنێکی تر لەم جیهانەوە بۆیە ئێمە ئێستا لەگەڵ دەست بەکار بوونمان هەوڵ دەدەین ئەو کارانە ئەنجام بدەین کە دوا ڕۆژ گروپەکانی IT بتوانن ڕۆڵی خۆیان ببینن لە کوردستان .



**نوڤەر محێدین لە وەڵامی ئەو پرسیارەدا دەڵێت :-**

ئـەو هەنگاوانـەی کـە لـە کوردسـتان پێویـستە بـنرێ بـۆ ئـەوەی زیـاتر بتوانـین کۆمەڵگایەکی وا دروست بکەین کە بتوانێ ئەو بابەتانە بەئاسانی وەربگیرێت کە ئەمرۆ ڕۆڵی هەیە بە تایبەتی ڕۆڵی کۆمپیوتەرو ئەنتەرنێت وە ئـەو بوارانـەی کـە لە گۆڕینـەوەی زانستەکان بەکار دێت لـە دەزگا جـۆر بـە جۆرەکـان بـە تایبەتـی ئێستا دەبینین ITلە وولاّتانی ئەوروپا بۆتـە بەدیلی زۆر شـت زۆریـش لـە کـات کورت دەکاتـەوە کەواتـە گرنگیـدان بـە IT پێویـستیەکە و دەبێـت لـە کودرستان حکومەتی هەرێم بایەخێکی تایبەت بەم بـوارە بـدات هـەوڵ بـدات لـە ڕێگـای ئـەو پسپۆرانەی کە تایبەتمەندن لەو بوارەدا بۆ پەرەپێدانی ئەو بـوارە لـە بەیـەك بەسـتنی ئـەم تەکنەلۆژیایە یـان لـە بـواری دیراسـاتی تەکنـەلۆژیا خـولی تایبـەت بکەنـەوە بـۆ خستنەگەری دام و دەزگاکـانی وەك تەلـەفزیۆن و رادیـو و میـدیاکان بـۆ ئـەوەی ئاسـتی رۆشنبیری خەلك بەرز بێت خەڵکی پسپۆریش ئەگەر لە ناو لـە وولاّت هەیـە سـودی لێ ببینرێ ئەگـە نـا خـەڵکانێکی پسپۆر لـە دەرەوە بێـن خـولی تایبـەتی بۆ لاوەکان بکەنـەوە چونکە لاوەکـان ئاینـدەی ئـەو وولاّتـەن ئێمـە نالێین ئێستا حکومـەت ببێـت بـە حکومەتێکی ئەلکترۆنی چونکە بەم حاڵەتە دەست بەتالیەکی زۆر پەیدا دەبێت کە خۆی ئێستا ناڵـە ناڵمانـە بـە دەسـت دەسـت بەتاڵیەوە وئەگەر لەو بارەی ئێستاوە یەکسەر بچینە سەر باری حکومەت ئـەلکترۆنی ئـەوە خـەلێکی زۆر بێکار دەمێنێتـەوە بۆیـە دەبێت هەنگاو بنێنن بۆ ئەم مەبەستە و دەبێت بیر لە درووست کردنی سیستەمی خانەنشینی بکرێت ئەو کات دەتوانن هـەنگاوی حکومەتی ئەلکترۆنی بکرێتە جدی کاری پێ بکرێت .

# بەرنامـــــەی Nokia pc suit
# بۆ بەستنەوەی ئەنتەرنێت لە ڕێگای مۆبایلەوە

ئا: کاوە سلێمان

کرداری بەستنەوەی مۆبایل بە ئامێری کۆمپیوتەر بۆ بەکارهێنانی ئەنتەرنێتی ناو مۆبایل ئەمە هەنگاوێکی زۆرگرنگە بەتایبەتی بۆ ئەوانەی کە حەزدەکەن بەردەوام ئەنتەرنێت بەکاربێنن و هەروەها بەردەوام وەك ئامێرێکی بچوك لەلایەن خۆیانە بیگێرن بەمەش ئەنتەرنێت زۆر ئاسانتر هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرێت بەڵام کرداری بەکارهێنانی ئەنتەرنێت بەرنامەیەکی تایبەت بەخۆی هەیە ئەویش بەناوی Nokia pc suit کە لە ڕێگای ئەو بەرنامەیەوە دەتوانیت مۆبایلەکەت ببەستیەوە بەئامێری کۆمپیوتەر بۆ بەکارهێنانی ئەنتەرنێت بەکارهێنانی ئەو بەرنامەیە کردارێکی زۆر گران نیە بەلکو کەمێك بە ووردی سەنج بدەن لەم هەنگاوانەی کە باسی بەرنامەکەی لێ دەکەین فێری بەکارهێنانی ئەم بەرنامەیە دەبن و تێیدەگەن و دەتوانن بەکاری بێنن سەرەتا بەرنامەی Nokia pc suit دادەبەزێنن لەسەر ئامێری کۆمپیوتەر پاشان دێین بەرنامەکە دەکەینەوە ئینجا مۆبایلەکە بەهۆی کێبلی تایبەت بەخۆی کە USB یە لەکۆمپیوتەر دەخەین بەرنامەکە بەم شێوەیە دەبێتەوە وێنە١




وێنە ١

سەیری بەرنامەکە بکە هێمای سێیەم کە نووسراوە Connect to the internet کلیکێکــی لەسەردەکەین لیستێك دەبێتەوە وێنە ٢



وێنە ٢

ئنجا کلیك لەسەر فەرمانی Setting لێدەدەیت لیستێك دەبێتەوە کە٣ بۆشایی تێدایە تەنها بۆشایی یەکەم پردەکەیتەوە بەنووسینی internet.korek.com ئنجا OK دەکەیت پاشان خۆی دێتەوە سەر لیستی دوەم ئنجا Connect لێدەدەیت و تۆزێك چاوەرێ دەکەیت خۆی Connectدەبێت و ئەنتەرنێتەکە دەکرێتەوە وێنە٣



وێنە ٣

# بەرنامەی
# ERROR DOCTOR

کۆمپیوتەر

بەراستی تا ئێستا ئەوەی من بینیبم و کارم پێکردبێ بە یەکێك لەباشترین بەرنامەکانی جیهانی دادەنێم تائێستا شتی وام هەرگیز بەرچاو نەکەوتوەو نەم بینیوە وەتاکو کارم پێنەکرد گرنگی ئەو بەرنامەیەم نەزانی چەندە ؟ بێگومان زۆرجاران وا رێك کەوتوە ئامێری کۆمپیوتەرەکانمان کارەبایان لەسەر براوە جا چ لەرێگای ups کانمانەوە بێت یاخود لەرێگای کوژانەوەی کارەبا بێت وە ئەوکوژانەوەی کۆمپیوتەرە بێگومان فایلێکی Error بەجێدێلێت لەناو کۆمپیوتەرەکانمانەوە پاشان ئەوفایلانە دەست بەزیادبوون دەکەن ئەوەش دەبێتە هۆی لێدران و تێکچوونی ویندۆز بۆیە دەبێت زوو ئەو فایلانە لەناوببردرێن یاخود زۆر جاران وادەبێت کەئێمە بەرنامەیەکی قورس دادەبەزێنین بۆسەرکۆمپیوتەرەکانمان پاشان کە کارمان پێی نامێنێت ئەوبەرنامانە لادەبەین ئەوەش پاشماوەیەك لەدوای خۆی بەجێدێڵێت ئەوەش دەبێتە هۆی زوو پربونەوەی هاردەکانمان ئەوەشیان دیسان دەبێتە بەربەستێك بۆتێکچونی ئامێری کۆمپیوتەرەکانمان بۆیە دەبێت زوو بەزوو چارەسەری ئەو مشکیلانە بکەین بۆئەم مەبەستەش بەرنامەی Error doctor یەکێکە لەبەرنامە بەهێزەکانی لابردنی فایلی نا تـــەواو واتا error file کارپێکردنی ئەوبەرنامەیە زۆر ئاسانە سەرەتا پاش دابەزاندنی بەرنامەکە لەسەر ئامێری کۆمپیوتەر دێین بەرنامەکە دەکەینەوە بەم شێوەیە وێنە ١




وێنەی ١

لە سەرەوەی بەرنامەکە Main نوسراوە یەکجار کلیکی لەسەر دەکەیت و پاشان لەخوارەوەی بەرنامەکە لەلای چەپ بەگەورەیی بازنەیەکی سورکراوە لەناو بازنەکەش scan now نوسراوە یەك کلیکی لەسەر دەکەیت پاشان چاوەرێ دەکەیت تا هەموو فایلە تێك چووەکان دێنە ناو بەرنامەکە وێنە۲




وێنەی ۲

پاشان لەخوارەوەی بەرنامەکە بەگەورەیی Remove نوسراوە یەك جار کلیکی لەسەردەکەیت هەموفایلە ناتەواوەکان رەش دەبنەوە وێنە ۳




وێنەی ۳

# Media Resizer PRO

ئا: گۆران


وێنەی ١

ئەم بەرنامە یەکێکە لەبەرنامە زۆرساناکان بەلام بێگومان شتی جوانی لێ دروست دەبێت زۆرجار ئێمە بەرنامەی وا سادەمان دەکەوێتە بەرچاو بەلام ئەگەر لەکارەکانی بکۆلینەوە دەبینین شتی زۆر گرنگ ئەنجام دەدات ئەمەش بۆئێمە شتێتی زۆربەسودە لەبەرئەوەی دەستکاری کردنی بەرنامە بەهێزەکان فێربوونی یەکجار ناخۆشە بەسانایی لێی فێرنابین بۆیە ناچارین پەنا ببەین بۆبەرنامە ساناکان هەندێك جاریش بەرنامە سادەکان شتی وەکو بەرنامە بەهێزەکان دێنێتە ئاراوە بەڵکو جوانتریش بەپێی توانای بەرنامەکە بۆنمونە ئەم بەرنامەی من ئێستا باسی دەکەم زۆر شتی نایابی پێدەکرێت لەبواری وێنەدا بەرنامەی Media Resize PRO توانای گۆرینی چوارچێوەکانی وێنەی هەیە بەشێوەیەکی جوان چۆنیەتی کارکردن لەسەر ئەوبەرنامەیە . سەرەتا پاش دابەزاندنی بەرنامەکە لەسەر کۆمپیوتەر ئینجا دێین بەرنامەکە دەکەینەوە پاشان لەخوارەوەی بەرنامەکە Add File هەیە یەکجار بەماوس کلیکی لەسەردەکەین دەبینین لیستی هاردەکان دەبێتەوە وێنە١


وێنەی ٢

پاشان هەروێنەیەکمان بوێت بۆدەستکاری ئۆپنی ناوبەرنامەکەی دەکەین لەرێگای ئەم لیستە وێنە٢

پاشان سه‌یری وێنه‌كه‌ بكه‌ له‌ناو به‌رامه‌كه‌ راسته‌و خۆ چوارچێوه‌كی زۆر جوانی به‌وێنه‌كه‌ به‌خشیوه‌ به‌لام گه‌ربمانه‌وێ ئه‌م چوارچێوه‌ لابه‌ین و یه‌كێكی تر بێنینه‌ جێگای ئه‌وه‌ سه‌یری لای راستی به‌رنامه‌كه‌ بكه‌ له‌سه‌ره‌وه‌ Change Style هه‌یه‌ یه‌ك كلیكی له‌سه‌ربكه‌ ئه‌م لیسته‌ ده‌بێته‌وه‌ وێنـــــه‌٣



له‌م چوار چێوانه‌ كامیانت به‌ دڵبێ یه‌كجار كلیكی له‌سه‌ر ده‌كه‌یت راسته‌و خۆ وێنه‌كه‌ت ئه‌م چوار چێوانه‌ وه‌رده‌گرێت هه‌روه‌ها هه‌ر له‌م لیسته‌ له‌سه‌ره‌وه‌ له‌لای راست Masks هه‌یه‌ كلیكی له‌سه‌ربكه‌ جۆرێكی تر له‌چوار چێوه‌ ده‌كه‌وێته‌ به‌رچاو وێنـــه‌ ٤



هـه‌روه‌ها لـه‌لای راست لـه‌ژێره‌وه‌ بۆشاییه‌ك هه‌یه‌ لـه‌ ته‌نیـــشت بۆشـــاییه‌كه‌ Browse هه‌یـــه‌ ئـــه‌ویان بۆهـه‌لگرتنی وێنه‌كه‌تـه‌ لـه‌كام هـاردت بـوێ هه‌روه‌هـا لـه‌ژێر ئـه‌وه‌ش هێمـای پلـه‌ی كـراوه‌ ئـه‌وه‌یان بـۆ ریندەركردنی وێنه‌كه‌ته‌ یه‌كجار كلیكی له‌سه‌رده‌كه‌یت چاوه‌رێده‌كه‌یت تا ته‌واو ده‌بێت وێنه‌ ٥



# بەرنامەی Adobe Premier

زنجیرە(١٢)

ئا: گەردی

دوای ئەوەی لە زنجیرەی رابردوودا باسی چۆنیەتی سووڕاندنی دیمەنەکانمان کردوو لەگەڵ کێشانەوەی دیمەنەکان بۆ دواوە بەرەو یەکێکێ لە سووچەکان ، سەیر دەکەین لەکاتی جولاندن و کێشانەوە دا باگراوندی دیمەنەکە سپی یە .(وێنەی ١).

لەم زنجیرەدا باسی چۆنیەتی گۆڕینی باگراوندە سپیەکە دەکەین ،کە دەتوانین لە شوێنی دا (دیمەنی جولاو، وێنە) زیاد بکەینە ژێر چینی دیمەنەکە:

١. هەر وەك دەبینین دیمەنەکە کەوتۆتە چینی ڤیدیۆیی یەکەم Video 1 A، لە شێوازی دەستکاری A/B Editingکە پێشتر چوینە سەری، دەتوانی ئەو بابەتەی کە دەمانەوێت وەك باگراوند دایبنێین لە چینی ڤیدیۆی Video١B بۆ ئەوەی لەو کاتەی کە بابەتی چینی سەرەوە دەست بە جولان و کشانەوە دەکات بەدەرکەوێ، بەلام ئێمە لێرەدا چینی ڤیدیۆیی Video١B مان بەکار نەهێنا بەڵکو لە شوێنی ئەو دیمەنی چوارەم دەگوازینەوە بۆ چینی ڤیدیۆیی دووەم Video2 ئەمەش چارەسەرێکە پشتی پێ دەبەستین کاتی کارکردنمان لە سەر شێوازی Single-Track Editing بێت .

٢. بابەتێکی ئامادەکراو کەلە بەرنامەکە خۆیدا هەیە دەهێنین ، ئەویش بریتییە لە Color Matte کە بریتی یە لە تابلۆی رەنگی دەتوانین لە بەرنامەی تەلەفزیۆنیەکان دای بنێین.

٣. لەپەنجەرەی Projectئایکۆنی دروستکردنی بابەتی نوێ Create Itemهەڵدەبژێرین. (وێنەی٣).

٤. لە لیستی Createفەرمانی Color Matteهەڵدەبژێرین.(وێنەی٤).

٥. تابلۆی هەڵبژاردنی رەنگ Color Pickerمان بۆ دەکرێتەوە. (وێنەی٥).



وێنە ١



وێنە ٢



وێنە ٣



وێنە ٤



وێنە ٥

٦.بە ئارەزووی خۆمان رەنگێک هەڵبدەبژێرین و okدەکەین ، تابلۆی Choose Name بۆمان دەردەچێت کە داوای ناولێنانی بابەتەکە دەکات یا ناوێکی لێ دەنێین وە یاخود ناوەکەی وەك خۆی دەهێلینەوە. (وێنەی٦).

٧.یەکسەر بابەتەکە دەئاخنرێتە نێو فایلەکانی پرۆژەکەمان لە پەنجەرەی Project .(وێنەی٧).

٨.ئەوەی کە دەمانەوێ کەوا ئەم تابلۆیە بکەینە باگراوند بۆ دیمەنی چوارەم لە کاتی سووران و کشانەوەی بەرەو دواوە وە دواتر هەڵدەستین بە بەکار هێنانی ئەم تابلۆیە وەك باگراوند بۆ نووسینە جولاوەکان ، ئێستا بابەتەکە هەڵدەبژێرین لە پەنجەرەی Projectرایدەکێشین و دایدەبەزێنینە نێو پەنجەرەی دەستکاری Time lineلە چینی ڤیدیۆیی Video١A، بەشێوەیەك کە بکەوێتە ژێر دیمەنی چوارەم .(وێنەی٨).

٩.ئەو بابەتەی کە زیادمان کرد بە شێوەیەکی ئاسایی کاتەکەی کەمەو ناتوانی ئەو رووبەرە پڕبکاتەوە کەوا دیمەنی چوارەم دایپۆشیوە ،بۆیە دەبێ کاتی تابلۆیەکە درێژ بکەینەوە ، بۆ درێژ کردنەوەی کاتەکەش لە سەر لێواری چەپەی کلیك دەکەین و بەقەد دیمەنی چوارەم کاتەکەی درێژ دەکەین . (وێنەی٩).

١٠.ئێستا بۆ بینینی ئەنجامی کارەکەمان کرداری بینین لە پەنجەرەی نمایش Program ئەنجام دەدەین .(وێنەی ١٠).



وێنە ٦



وێنە ٧



وێنە ٨



وێنە ٩



وێنە ١٠

# بەرنــــــامەی
# Full Video Converter

ئا : فاخر مەحمود

بەرنامەیەکی بەهێزە و توانای گۆرینی بۆچوارجۆری ڤیدیۆیی وەکو MPEG AVI WMV Real Media هەیە هەروەها توانای گۆرینی ڤیدیۆی هەیە بۆ وێنەی وەکو BMP JPG PNG GIF هەروەها دەتوانێ ڤیدیۆ راستەوخۆ بگۆرێت بۆدەنگ جۆری WAVE MP٣ OGG WMA هەروەها توانای چەند ڤیدیۆیەك بەیەکەوە گۆرین و هەروەها کۆمەڵێك دەنگ بەیەکەوە هەیە بەم جۆرە ناوی لەخۆی ناوە Full Video Converter بەراستی ناوەکە شایانی خۆیەتی لەبەرئەوەی بەرنامەیەك ئەوهەموو کارەبکات من پێی دەڵێم نایاب وەك دەزانن هەموو گۆرینێك پێویستی بەبەرنامەیەك هەیە کەم بەرنامە هەیە لەکارێك زیاتر ئەنجام بدات بەڵام بەرنامەی Full Video Converter زیاتر لە ١٥ جۆر کار ئەنجام دەدات بەراستی شتێکی بەسودە بەتایبەتی ئەوانەی خولیای بەرنامەکانی گۆرێنی شیوازی فایلی دەنگی یان ڤیدیۆیین ئنجا کارکردن لەسەر ئەوبەرنامەیە زۆر گران نیە کە نەزانرێت کاری پێبکەیت بۆنمونــە ئەگــەر بێــت و بەرنامەکــە دابەزێنــین لەسەرکۆمپیوتەر پاشان بێین بەرنامەکە بکەینەوە دەبینین لەلای چەپ لەسەرەوە بۆشایەك هەیە هەروەها لەلای راست لەخوارەوە شاشەیەك هەیە هەروەها لەلای چەپ لەخوارەوە چەند نوسینێك هەیە بۆشایی سەرەوە هێنانە ژوورەوەی ڤیدیۆیە بۆناو بەرنامەکە وێنە١



وێنە ١

پاشــان ئەوڤیدیۆیانــەی کەهاتوونەتــە نــاو بەرنامەکــە یەکێکیان رادەکێشیت بۆناو شاشەکەی خوارەوە وێنە ٢



وێنە ٢

پاشان لە ناوەراست لەلای چەپ mpeg avi wmv real media هەیە و هەریەك لەوانە هێمای راست لە تەنیشتیان دراوە هەر کامەیانت بوێت هێماکەی دادەگریت وێنە ٣



وێنە ٣

پاشان لەلای چەپ To Audio هەیە واتا ڤیدیۆکە دەگۆرێت بۆ دەنگ هەمان کردار دوبارە دەکەیتەوە هەر وەها لەژێرئەوە To Image هەیە واتا گۆرینی ڤیدیۆ بۆ وێنە هەمان کرداری سەرەتا دوبارە دەکەیتەوە ئینجا بۆشایەك هەیە لەخوارەوە بۆدیاری کردنی هاردەکەیە کە پارچە ڤیدیۆکەی دەچێتە ناو وێنە ٤ ئنجا Convert هەیە لەخوارەوە یەکجار بەماوس کلیکێك لەسەری بکە پاشان چاوەروان بە تا ریندەرەکە تەواو دەبێت بەم شێوەیە کرداری گۆران پەیدادەبێت



وێنە ٤

# بەرنامەی ئۆتۆ کـــــاد

## زنجیری ۱۰

ئا: غزاله یونس

له باسی ئەم جارەماندا له درێژەی زنجیری بەرنامەی ئۆتۆ کاد باسی زۆربەی ئەو فرمانانەمان کرد کە بە هۆیانەوە دەتوانین جەندەها وێنەو کاری ئەندازەیی ئەنجام بدەین لەبەشی ئەم جارەدا دەچینە سەر وێنەی سێ لایی یان وێنەییەکی بەر چەستە ئنجا بۆ درووست کردنی (وێنەی ۱) کە وێنەی خانووییەکە کە لە سێ لاوە دیارە پێویستمان بەم چەند ڕێگاییەی خوارەوە دەبێت.

١ـ درووست کردنی لاکێشەییەك دووریيەکانـــی ٦,١٠ وەك بناغەی خانووەکە پاشان لەشریتـــی Modify.....Offset ئەستووریەك دەدەینە لاکێشەکە بەپانی ٠,٢٠ سم بە بانگ کردنی فرمانەکە پاشان ئەستوورییەکەی کە ٠,٢ پێی دەدەین پاشان داوای دەست نیشان کردنی لاکێشەکە دەکات ئێمەش دەست نیشانی دەکەین پاشان کلیك لە ناوەوەی لاکێشەکە دەکەین (وێنەی ٢).لەلیستی VIEW----٣DVIEW----ISOMETRIC بانگ دەکەین بۆ ئەوەی وێنەکەمان بە گۆشەی ٣٠ پلە ببینین یان بە شێوەیەکی سێ لایی وێنەکە ببینین(وێنەی ٣).

٢-بۆ دروست کردنی دیوارەکان بە شێوەی خشتەیەك پێویستمان بە BOXدەبێت (وێنەی ٤).



وێنە ١


وێنە ٢


وێنە ٣


وێنە ٤



پاش بانگ کردنی فرمانەکە بەشێوەیەکی هەرەمەکی لە هەر لایەکی دیوارێك دووکلیك دەکەین لە دووگۆشەی بەرامبەر یەکتر. پاشان داوای بەرزی دیوارەکە دەکات توێش لە Command دەنووسی ٣ کە دەکاتە بەرزی دیوارەکە. شێوەیەکی وەك( وێنەی ٥) بەدەست دەهێنین.

وێنە ٥

٣- ئەگەر سەیری دیوارەکان بکەین دەبینین تێهەڵکێشانێك هەیە (وێنەی ٦) بۆ جاکردنەوەو دەستکاری کردنی ئەم تێهەڵکێشانە بانگی فرمانەکە دەکەین (وێنەی ٧) وێنەکەمان دەست نیشان دەکەین پاشان Enter. ئەوا دیوارێکی یەك پارچەمان بەدەست دەکەوێت(وێنەی ٨).



وێنە ٦



وێنە ٧



وێنە ٨

٤. ئێستا ژوورێکمان هەیە بۆ کردنەوەی دەرگاو پەنجەرە سەرەتا بۆ دروست کردنی دەرگا سەرەتا لەیەك لەلاکانی دیوارەکە پاش بانگ کردنی فرمانی Box کلیکێك لەیەك لە لایەکانی دەکەین لەسوچێکی ڕووی ژوورەوەی دیوارەکە بەشێوەیەکی هەرەمەکی پاشان دەنووسین( ٢,٠-،١) واتە (پانی دیوارەکەیە بۆیەش بەسالبە چونکە بۆ خوارەوە دێت ،درێژی Shift+٢ ) ئینجا داوای بەرزی دەرگاکە دەکات تۆ دەنووسیت ٢ کە دەکاتە بەرزی دەرگاکە.

٥. بۆ جیا کردنەوە ی دەرگا لە دیوارەکە (وێنەی ٩) بانگ دەکەین سەرەتا کلیك لەسەر دیوارەکە دەکەین Enter دەکەین پاشان فەرمانەکەمان هەر کاریگەرە ئنجا کلیك لەسەر دەرگاکە دەکەین Enter.بۆ ئەوەی بزانین دەرگاکەمان لەدیوارەکە جیا کردۆتەوە بانگی فرمانێك دەکەم(وێنەی ١٠) لە لیستی View ئەمیش بۆ ئەوەیە سێبەرێك بدەینە ژوورەکە بانگ دەکەین ئەوا وێنەی ژوورێکمان بۆ درووست دەبێت وەك وێنەی (وێنەی ١١) و بەم جۆرە کۆتایی دێت بە درووست کردنی شێوەیەکی سێ لایی .



وێنه ٩

وێنه ١٠



وێنه ١١



# بەرنامەی
# Cr@@gle

کۆمپیوتەر

ئەو بەرنامەیە هەڵدەستێت بەدۆزینەوەی هەر کراکێك یاخود هەر سریالێك یاخود هەر گرنگی ئەوبەرنامەیە ئەوەیە کاتێك تۆ بەرنامەیەك سێتەپ دەکەیت پاشان بەرنامەکە کارناکات و داوای سریالت لێدەکات یاخود داوای کراك دەکات تۆش لەم کاتە ئەگەر کراکەکەت نەبێت یاخود ژمارەی نهێنی ئەوبەرنامەت نەبێت ئەوا سود لەم بەرنامەیە وەرناگریت و دەبێت رەشی بکەیتەوە بەڵام بەرنامەی Cr@@gle ئەم کارەت بۆئاسان دەکات و ناهێڵێت بەرنامەکانت بێسوود بێت و وادەکات بەرنامەکانت سودیان بۆتۆ و بۆکەسی تریش هەبێت ئەمەش زۆر گرنگە لەبەرئەوەی ئیمرۆ زۆربەی بەرنامەکانی کۆمپیوتەر لە بازارە ئازادەکان دێن بۆناو بازارەکانمانەوە ئێمەش دەبینین ئەوبەرنامانە زۆربەیەان کراکیان دەوێت یان سریال نەمبەریان لەگەڵدانیە بۆیە زۆر بەپێویستی دەزانین کە ئەم بەرنامەیە بەکاربێنن بۆئەوەی کراك و ژمارەی نهێنی بەرنامەکان بەدەست بینن بەئاسانی بۆئەم کارەش



وێنەی ١

بەرنامەکەت دامەزراندبێت و ئنجا بەرنامەکە دەکەیتەوە و ناوی ئەو بەرنامەیە دەنوسیت کە پێویستیت بە کراك یان سریال نەمبەرەکەی هەیە لەناو بۆشایی سیرچەکە دواتر کلیك لەسەر فەرمانی سیرچ دەکەیت پاشان چاوەڕێ دەکەیت تا بەرنامەکە لە ناو ئەنتەرنێتدا دەگەڕێت و کراکەکە یان سریالەکەت بۆ دەدۆزێتەوە ئەو کات دەتوانی کراکەکە یان سریالەکە بپارێزیت وێنەی ١

بەلام دەبێت لەوکاتەدا خەتی ئەنتەرنێتت کرابێتەوە لەبەرئەوەی کراکەکان لەئەنتەرنێتدا دەبینرێنەوە بەلام بۆدۆزینەوەی سریال نەمبەرەکان دێیتە سەربەرنامەکە سریال هەڵدەبژێریت ئینجا سیرچ کلیك دەکەیت وێنەی ٢



# بەرنامەی Capture



ئەوبەرنامەیە شتێکی زۆر بەسودە بەتایبەتی بۆ کۆمپیوتەری لابتۆپ ئەوبەرنامەیە بۆ وێنەگرتنی سەر دیسك تۆب بەکار دێت واتا لەجێگای دوگمەی پرینت سکرین بۆ وێنەگرتن ئەم بەرنامەیە بەکار دەهێنرێت . ئەمەش زۆر گرنگە وەك گوتمان لابتۆپ دوگمەی برینت سکرینی نیە ئەمەش دەبێتە هۆی دروست بوونی گیرو گرفت بۆئەوانەی شەرحی بەرنامەیەك دەکەن یاخود دەیانەوێ بە دوگمەی برینت سکرین وێنە بگرن بەکارهێنانی ئەم بەرنامەیە زۆر سادەیە سەرەتا دێین بەرنامەکە دەکەینەوە بەرنامەکەش پێویستی بە سێتەپ ناکات لەشێوەی کامیرایەك دروستکراوە سەیری وێنە ١ بکە بەرنامەکە بەم شێوەیە تەنها لەسێ بەشە نوسین پێکهاتوە یەکەمیان بریتی یە لە capture section of the screen ئەوەیان لەکاتی کلیك کردن بۆت دیاری دەکات و پێت دەڵێ بەماوس دیاری بکە لەکوێ تا کوێت دەوێ وێنەت بۆ بگرم تۆ بە ماوس بۆی دیاری بکە وێنە ٢



وێنەی ١



وێنەی ٢

لەکاتی شوێنەکەت بۆ دیاری کرد ئنجا کە دەستت لەسەر کلیك هەڵگرت ڕاستەو خۆ لیستێك دێت پێت دەڵی وێنەکە لەکوێ خەزن کەم تۆش ژمارەیەکی بۆدابنێ و لەهاردێك بیپارێزە وەك وێنەی ٣



وێنەی ٢

دوای ئەوە بچۆرە سەر نوسینی دووەم ئەویش بریتیە لە capture full screen واتا وێنەگرتنی سەر رووبەری دیسك تۆپ بەتەواوی واتا ئەگەر تۆ کلیکێك لەسەر ئەم نوسینە بکەیت ڕاستەوخۆ لیستێك دێت دەڵێ وێنەکەت خەزن بکە سەیری وێنە ٤


وێنەی ٥


وێنەی ٤

دوای ئەوە بچۆرە سەر بەشە نووسینی سێهەم کە بریتیە لە capture full screen in 10 second واتا وێنەگرتنی سەر ڕووبەری شاشە لە ١٠ سانیەدا سەیری وێنە ٦ وێنە ٧ بکە


وێنەی ٥


وێنەی ٤

# بەرنامەی
# RightClick 1.0 Enhanced



بەهۆی ئەوبەرنامەیە ئاسانکاریەکی تەواو دێتە بەردەستت بە تایبەتی بۆ ئەوانـەی بەپەلە کاردەکەن لەسەر کۆمپیوتـەر بـەهۆی کلیـك کردن بەلای راست هەرهەموو ئەو بەرنامانەی لەناو لیستی Start هەیە دێتە بەرچاو بەشێوەیەك لەهەر شوێنێك لەسـەر رووی شاشە کلیکێك بکەیت لەو شوێنە پرۆگرام ستارت دەبێتەوە سەیری وێنە ١ بکە.

وێنە ١

# بەرنامەی فـــــلاش Mx

## زنجیرە( ١٢ )

ئا: فەیسەل مەعروف

لیستی ئاخنین Insert (وێنەی١)

١)گـۆڕینی هێمـاConvert to Symbol:ئـەم فەرمانـە هەڵدەسـتێ بـە گۆڕیـنی بابەتەکان بۆ هێما بۆ سێ جۆر (ڤیدیۆ کلیپ ، دوگمە ، وێنە).

٢) زیـاد کردنـی هێمـای نـوێ New Symbol: دروسـتکردنی هێمـای نـوێ بـە تایبەتمەندی دیاری کراو .

٣)زیاد کردنی چینLayer : دروستکردنی چینێکی نوێ.

٤)Folder Layer: زیـاد کردنـی فۆڵدەر کـە چینەکان لـە خـۆ بگـرێ ، ئەمـەش گرنگە بۆ رێکخستنی کارەکان.

٥)زیاد کردنی رێ رەوی جوڵەGuide :ئەمەش چینی رێبەری جوڵەیە.

٦)زیـاد کردنــی چـوار چـێوەFrame و سـڕینەوەیframe ، چـوار چـێوەی کلیلKey frame ، چوار چێوەی کلیلی بەتاڵ Blank Key frame.پێشتر باسیان لێوە کراوە .

٧)زیاد کردنی جوڵە لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتیکی تر Motion Tween پێشتر باسی لێوە کراوە.

٨) زیاد کردنی دیمەن: بریتی یە لە زیاد کردنی دیمەنێك یاشانۆیەکی کاری نوێ بە تایبەتمەندی شانۆی بنچینەیی یا ئامادە کراوی بەرنامەکە خۆی.

٩)سڕینەوەی دیمەن : Remove Seene ئەم فەرمان کاتێ کارا دەبێ کە زیاتر لە دیمەنێکمان هەبێ.

لیستی گۆڕانکاریModify (وێنە٢)

هـەموار کردنـی چـوار چێوە Frame: هەڵگێرانە وەی چوار چێوە بـە پێـەوانــەی هــەنگاوەکانی کــار کــردنReverse ، بــۆ نمونــە بازنەیەکمان دروست کردووە لە چەپەوە بۆ راستە دەجوڵێ وەکاتی ئەم فەرمانە هەڵدەبژێرین جوڵەی بازنە لە راستەوە بۆ چەپ دەگۆڕێ ، وە یاگۆڕینی بۆ چوار چێوەی کلیل وە بۆ چوار چێوەی کلیلی بە تاڵ.

گـرووپ کـردنGroup:رێگایەکـە بـۆ دروسـتکردنی شـێوەی ئـاڵۆز و سـەربەخۆ لـە سـەرجەم پێکهاتـەکانی تـر .بـۆ نمونـە ئوتومبیـل و تایەکانی ، ئوتومبیلەکە لە خاڵێەوە بۆ خاڵێکی تر دەجوڵێ بە تایەکانی بـە شێوەیەکی بازنـەیی دەخوڵێتـەوە ، وە تەنسیقێکی تەواویش هەیە لە جوڵە ئەم تەنسیقە لە رێگای ئەم فەرمانەوە دەبێت.



وێنەی ٣

لیستی دەق Text (وێنەی٣)

فەرمانەکانی ئەم لیستە تایبەتن بە نووسین جۆری فۆنت و قەبارەی لە گەڵ ریز کردنی نووسین و شێواز وماوەی نێوان پیتەکان .

لیستی پەنجەرە )Windowsوێنەی٤)

ئەم لیستە سەرجەم هەلبژاردنەکانی نمایش کردنی سەرەکی لە ئامراز و کەرەستەکان لە خۆ دەگرێت:

ئامرازە سەرەکیەکان Tool bar

١. ئامرازی سەرەکی Main: ئایکۆنەکانی فایلی نویٚ و کردنەی فایل و چاپ کردنی لە خۆ دەگرێت.

٢. بار Status: دەکەوێتە خوارەوە لە بەرنامەی فلاش کاریشی دەرخستنی کاری فەرمانی هەڵبژێردراوە لە لیستەکان.

٣. کۆنترۆڵ Controller: بریتی لە جێبەجێکردنی دیمەنەکان.

شریتی ئامرازەکان Tool:نیشان دانی ئامرازە یارمەتی دەرەکانی وەك قەڵەم و هێڵ و ..هتد.

کتێبخانە Library: بابەتەکانی دیمەنەکانمان بۆ بە دیار دەخات کە کاری تێدا دەکەین.

چۆنیەتی نمایش کردنی ئامرازەکان Panel set:ئەم فەرمانە چەند هەڵبژاردنێکی تێدایە کار ئاسانن بۆ نمایش کردنی ئامرازەکان بەم شێوەیەی گونجاوە بۆمان .



وێنەی ٤

نمایشی لەدوای یەك Onion

بریتی یە لە دەرخستنی لە دوای یەکی جولەی شێوە لە لە لایەکەوە بۆ لایەکی تر ، سوودەکەشی ئەوەیە(دیقەت لە جولە ،زانینی رێرەوی جوڵە ئایا شێوەکە لە گەڵ شێوەیەکی تر بە یەك دەکەون یانا).

١. بازنەیەك دروست دەکەین لە لایەکەوە بۆ لایەکی بجولیٚalways show. (وێنەی٥)



وێنەی ٥

٢. ئێستا ئایكۆنی جولەی لە دوای یەك Marker هەڵبژێرە، هەمان كردار دووبارە بكەوە یائایكۆنی Onion٥هەڵبژێرە.(وێنەی ٦).

٣. ئایكۆنێكی تر كلیك بكە كە هێلە دەرەوەی بازنەكە نیشان دەدات. (وێنەی٧).

٤. سەیر دەكەین كە شێوەكە لە سەر شانۆی كار كردن بەم شێوەی لیَ دیَ كە لە (وێنەی ٨) دا دیارە .

٥. ئێستا هەڵدەستین بە جولاندنی هێڵە سوورەكە لە سەر شریتی كات ، چۆنیەتی جولەكە و چۆنیەتی بە دیار كەوتنی دەبینین. (وێنەی٩)

٦. دەتوانین جولەكە هەموار بكەین یا زیاتر ئاڵۆزی بكەین بە زیاد كردنی چوار چێوەی كلیل یا خاڵی گۆڕان، گەر بمانەوێ خاڵی گۆڕان زیاد بكەین لە سەر چوار چێوەی ژمارە ٢٠ بە هۆی ماوسەوە دەچینە سەر چوار چیوەی ژمارە ٢٠ و چوار چێوەی كلیلی بۆ زیاد دەكەین لێرەدا بازنەكە دەجولێنین لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی تر ، دواتر سەیری ئەنجامەكە دەكەین ، ئەم جۆرە جولەیە لە كاتی جیَ بە جێكردنی كارەكان بە دەر ناكەوەیَ بەڵكو تەنها لە سەر شانۆی كار كردن بەدەردەكەویَ.(وێنەی١٠)




وێنەی ٦



وێنەی ٧




وێنەی ٨



وێنەی ٩



وێنەی ١٠

# بەرنامـــــەی ACDSee

بەرنامـەی ACD See بەرنامـە یـەکی سـەرکەوتووە و زۆر بـە هێـزە بـۆ نیـشاندانی وێنـە و شـێوەی نیـشاندانی وێنـەکان لـەم بەرنامەیەدا هاوشێوەی نیـە کـە نیشلنـدانی وێنەکە بە قەبارەی ڕووبەری بەرنامەکەیـە بـێ ئەوەی هیچ لـە ڕوونـی وێنەکە کـەم بکاتەوە هەموو شێوەکانی وێنە نیشان دەدات . هـەروەها کارکردنێکی زۆر ئاسانی هەیە کە دەبێتە یارمەتیدەرێکی سـەرەکی مرۆڤ و ئاسانکاریەکی زۆرمان بۆ دەکات هەروەها وێنەکان بەشێوەیەکی گشتی پیـشان دەدات لـەناو هـاردی کۆمپیوتـەر ئەمـەش دەبێتە ئاسانکارێکی تر بۆمان چالاکی ئەو بەرنامە دەبینین ئەگەر کاری پێبکەین سەیر دەکەین زۆر شتمان بۆجێبەجێ دەکات کە پێویستمان بەچـەند بەرنامەیـەکی تـر نابێت هـەر ئەو بەرنامەیـە کاری چـەند بەرنامەیـەکی ترمـان بـۆ دەکـات لـەو سـودانەش نیشاندانی ڤیدیو هەر لە ناو ڕووبەری بەرنامەکەوە ســـــــودەکانی بەرنامەی ACD See .

١. نیشاندانی وێنەکان یەك بەدوای یەك بەگوێرەی ژمارەکانیان لەهەر فایلێك بێت .

٢. نیشاندانی وێنەکە بەشێوەیەك هیچ لەقەبارەی وێنەکە نەگۆرێت.

٣. گۆرینی جۆری فایلی وێنەکە بۆنمونە jpgبۆ bmp .

٤. دانانی وێنەکە بۆ سەرشاشە وەك باگراوند .

٥. هەروەها کۆپی کردنی وێنەکە وە دانانی وێنەکە لە فایلێکی تر .

٦. نیشاندانی هەموو وێنەکان لەیەك کاتدا و یەك بەدوای یەك بەجۆری کلیپ .

٧. هەروەها رەشکردنەوەی وێنەکان و گۆرینی ناوی وێنەکان .






# به‌رنـــــــــامه‌ی Emule

ئا: عبدالله مه‌ریوانی

به‌رنامه زۆرن بۆ دابه‌زاندنی به‌رنامه‌و فایلاتی ویستراو له تۆری ئینته‌رنێت که هه‌ریه‌کێکیان کۆمه‌ڵێك خه‌سڵه‌تی تایبه‌ت به‌خۆی هه‌یه بۆ نموونه هه‌یانه ئه‌گه‌ر هێڵی ئینته‌رنێتیش پچڕا پاش گه‌رانه‌وه‌ی هێڵه‌که به‌رده‌وام ده‌بێت له کاره‌که‌ی خۆی. لێره‌دا حه‌ز ده‌که‌م یه‌کێك له‌و به‌رنامانه راڤه بکه‌م ئه‌ویش به‌رنامه‌ی (EMule) ه ، ئه‌م به‌رنامه‌یه کۆمه‌ڵێك خه‌سڵه‌تی نایابی هه‌یه به نموونه فه‌رمانی به‌دوادا گه‌رانی هه‌یه که له دوای هه‌ر به‌رنامه‌یه‌ك دا ده‌گه‌رێت که پێویستیت پێی هه‌بێت . لێره‌دا زۆر به‌کورتی باسی EMule تـان بـۆ ده‌کـه‌م بـه‌ڵام ده‌بێـت به‌رنامه‌کـه‌تان دامه‌زراندبێت له‌سه‌ر سیسته‌مه‌که‌تان .

١. پێـش هـه‌موو شتێك ده‌بێـت كلیك له‌سـه‌ر فه‌رمانی connect بکـه‌یت بۆئـه‌وه‌ی به‌رنامه‌کـه ئاماده‌بێـت بـۆ داونلۆد کردن.



وێنه ١

٢. فه‌رمانی Search له‌م فه‌رمانه‌دا له بۆکسی (Name) دا نـاوی ئـه‌و فایلـه ده‌نووسین کـه ده‌تـه‌وێت بـه دوایـدا بگـه‌رێیت بۆنموونـه(Knoppix) پـاش ئـه‌وه‌ی کـه به‌رنامه‌که فایله‌که‌ی دۆزیه‌وه کلیکی لای راست له‌سه‌ر ئه‌و فایله ده‌که‌ین که ده‌تـه‌وێت داونلۆدی بکـه‌یت ئینجا کلیك له‌سه‌ر فه‌رمانی ( Download ) ده‌که‌ین .



وێنه ٢

٣- Transferبۆ ئەوەی سەیری ئەو فایلانە بکەین کە داونلۆد دەکرێن .




وێنە ٢

**تێبینی :**

- ئەم بەرنامەیە لەسەر سیستەمی ریزبەندی کاردەکات واتە بۆهەر فایلێك دەبێت ریزبەندی بگرێت بۆئەوەی کاری داونلۆد ئەنجام بدەیت.
- دەتوانیت ئەم بەرنامەیە لەم ماڵپەرە بەخۆرایی داونلۆد بکەیت www.emule-project.com

# Quran in word

## دابەزاندنی قورئانی پیرۆز بۆ ناو بەرنامەی وۆردو وەرگێڕانی بۆسەر زمانی ئینگلیزی

ئا: بەختیار سەباح رواندزی
baxtear@zarikrmanji.com

ئەم بەرنامەیە یەکێکە لە بەرنامە باش و بەسوودەکان، کە زۆر گرنگە ئێمە لەسەر کۆمپیوتەر هەمان بێت. بۆ ئەوەی هەر کاتێك پێویستیمان بە ئایەتێك یان سورەتێك لە قورئانی پیرۆز هەبێت، بە یەك کلیك دایبەزێنینە سەر لاپەڕەکە. بەکارهێنانی بەرنامەکە زۆر ئاسانە، دوای ئەوەی کە بەرنامەکەت دابەزاندە نێو کۆمپیوتەر، دەچیت بەرنامەی ( Microsoft Word ) دەکەیتەوە، دەبینین لە شریتی مینو بار پاش فرمانی ( Help ) لیستێکی تر زیاد بووە، بەناوی ( Al-Quran). سەیری وێنە ( ١ ) بکە.



وێنەی ١

ئەگەر ویستمان سورەتێك یـــان ئایەتێك دابەزێنینە سەر لاپـــەڕەی وۆردو راستەوخۆش وەریبگێڕیتـــە ســـەر زمانی ئینگلیـــزی ئەوە کلیـــك لەســـەر فرمـــانی: (Get Arabic+Translation) دەکەین و پەنجەرەیەکمان دەداتێ بۆ ئەم مەبەستە لە بەرامبەر ئەو شوێنەی نوسراوە ( Surat)، سورەتێك دەستنیشان دەکەین و لـــە شوێنی ( Ayat )، بە ئارەزووی خۆمان لە ئایەتی چەند بۆ چەندمان بوێت ژمارەکەی دەستنیشان دەکەین، وە دەشتوانین لە شوێنی (Font Size ) قەبارەی نووسین دیار بکەین و دواتر کلیکی ســـەر( ok ) بکەین. سەرنج بدە وێنە (٢)



وێنەی ٢

بەڵام ئەگەر ویستمان تەنها قورئانەکە دابەزێـــت وەری نەگێڕێت بـــۆ سەر زمانی ئینگلیزی ئەوە کلیــك لەســـەر فرمانـــی ( Get Arabic ) دەکەین‌و بەهامان شێوەی تر سوڕەت‌و ئایەتەکان دەست نیشان دەکەین. سەرنج بدە وێنە (٣ ) یەکێك لە نموونەکان کە سوڕەتی ( البقرە )یە.




نەی ٣

## ئاگاداری

بۆ هەموو ئەو بەڕێزانەی کە توانای نووسینیان هەیە لە بواری کۆمپیوتەر وئەنتەرنێت ئەگەر توانای نووسینی بابەتیـان هەیە لەم بوارەد دەتوانن بەشداری بکەن لە گۆڤاری کۆمپیوتەر ودەتوانن سەردا نمان بکەن یان بابەتەکانیان بنێرن بـۆ ئەم ناونیشانە :

هەرێمی کوردستانی عیراق / یەکەی کۆمپیوتەر لە دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری جادەی شەست مەتری نزیك هۆڵی زمرد ، یان پەیوەندی بکەن بە سەرنووسەرەوە بەم ناونیشانە : مەڵبەندی کۆمپیوتەری ئاراس ، هەولێر بەرامبەر قەلا ، بالەخانەی قەیسەری حاجی یەحیا نهۆمی دووەم یان بە ژمارە تەلەفۆنی: ( ٢٢٢٢٧٢١ ) مۆبایـل: ( ٠٧٥٠٤٦١٨٠٤٥ ) یـان پـۆسـتی ئەلکترۆنی

E-MAIL: COMPUTER_MAGAZINE_2005@YAHOO.COM
E-MAIL: ARAS_CO_CENTER@YAHOO.COM

### تێبینی:

- هەر بابەتێك بلاّو بکرێتەوە پاداشنی پێ دەدرێت.
- هەر بابەتێك لە شوێنێك یان ڤۆڤارێکی تری کوردی بلاّو بکرێتەوە ئێمە بلاّوی ناکەینەوە.
- بابەتەکانتان ئەگەر نەشیا بۆ بلاّو کردنەوە ئەوا ناگەڕێتەوە.
- هەر کەسێك بابەت ئەنێری بۆ بلاّو کردنەوە با باەتەکەی لەسەر فلۆپی دیسك یان فلاش میموری بێت وێنەی روونکەرەوەکـــان بە جیـــا لە نێو فۆڵدەرێـــك دا دابێـت وبابـەتـەکـــەی بە بەرنـــامەی MICROSOFT WORD بنووسێت.

# چۆن دۆسیە فەوتاوەکانت دەگێڕیتـــــەوە ؟

ئا: موحەمەد ئەمین

زۆر جار ئەوە ڕوودەات کە دۆسیەیەکت دەفەوتێت و ناتوانیت بیگێڕیتەوە هەرچەندە زۆر پێوەی هیلاك بوویت ، بەڵام بەرنامەی ("solid labs" ) ئەو گرفتەت بۆ چارەسەر دەکات . ئەو بەرنامەیە بەوە جیا دەکرێتەوە کە بەکارهێنانی زۆر ئاسانەو دەتوانیت بەهۆیەوە ئەو دۆسیە فەوتاوانەی سیدیە پەستێوراوەکان جارێکی دی بگێڕیتەوە و بیان خوێنیتەوە زۆر بە ئاسانی . بەرنامەکەش گونجاوە بۆ هەموو سیستەمەکانی وێندۆز واتا لەسەر هەموو جۆرە سیستەمەکان کار دەکات بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی ئەو بەرنامەیەو دابەزاندنی بۆ ناو کۆمپیوتەرەکەت دەتوانی سەردانی ئەم سایتە بکەیت : www.solidlabs.com



# چەند فەرمانێکی گرنگ لە پرێنتەر





وێنەی ١

چاپ کردن یان پرێنت کردنی هەر فایلێك لەرێگای ئامێرێکەوە دەبێت و ئەو ئامێرەش بە پرێنتەر ناسراوە و یەکێکە لە و ئامێرانەی کە بە دەرکردنی زانیاریەکانی کۆمپیوتەر دادەنرێت واتا دەچێتە خانەی ئامێرەکاکانی (Out put) زۆرترین بەکارهێنانی ئەم ئامێرە راکێشان و دەرکردنی پەرەکانی وۆردە بەلاَم دوای پەیدابونی پرێنتەری رەنگاو رەنگ وێنەو فایلی تری گرنگ لەرێگای پرێنتەرەوە پرێنت دەکران ئینجا زۆری داواو زۆری پێویستی سەر پرێنتەر وای لەناوەندەکانی دروست کردنی پرێنتەر کرد کەوا چەندان جۆری پرێنتەری رەش و سپی و رەنگاو رەنگ دروست بکەن بەلاَم هەمویان لە تایبەت مەندیەکانی پرێنت کردن وەك یەکن بۆ هەریەکەشیان خاوەنی کۆمەڵێك تایبەتمەندین . بۆ ئەم جارە باس لە پرێنت کردنی باگراوند دەکەین واتە زۆرجار ئێمە وێنەیەك یان رەنگێك یان هەر شتێکی جوان دەکەینە باگراوندی نوسینەکەمان بەلاَم کاتێك پرێنتی دەکەین دەبینین باگراوندەکە پرێنت نەبوە بۆ ئەم مەبەستەش دوای ئەوەی کلیك لەسەر پرێنت دەکەین بۆکسی زانیاریەکانی پرێنت دەکرێتەوە . بروانە وێنەی (١)


وێنەی ٢

پاشان کلیك لەسەر (Options) دەکەین وەك لەوێنەکەدا رون کراوەتەوە . ئینجا بۆکسێکی تر دەکرێتەوە بروانە وێنەی (٢) پاشان ئێمە نیشانەی دەست نیشان کردن لەسەر زاراوەی (background color image) دەکەین بروانە وێنەی (٢) پاشان (Ok) دەکەین و دوایی کلیك لەسەر پرێنت دەکەین دەبینین پەرەکە بە تەواوی زانیاریەکان و باگراوندەکە پرێنت بوە .

# ٣٨ ڕێنمایی بۆ خێراکردنی کۆمپیوتەر

زنجیرەی نۆیەم و کۆتایی

شاخەوان عمر حسن
shakhawano@yahoo.com

٣١- چەند جێبەجێکاریەکی گرنگ لە وێب : وەکو وتمان خێراکردن و باشتر کردنی هەر بەشێکی کۆمپیوتەر کاریگەر دەبێت لەسەر خێرایی کۆمپیوتەر . لەم ڕوانگەشەوە چەند جێبەجێکاریەك لە وێب بۆ خێراکردنی هەڵدانەوەی پەرەکانی وێب .



- نیشان نەدانی وێنە : بۆ ئەوەی هەر پەرەیەکی وێب بکەینەوە وێنەکانی دەرنەکەون . وە بەدەرنەکەوتنی وێنەی واتا خێرایی هەڵدانەوەی پەرەکانی وێب بۆ ئەم مەبەستەش دێین لە کۆنترۆڵ پەنال کلیك لەسەر (internet Options) دەکەین بۆکسێك دەکرێتەوە بروانەوێنەی (١)



پاشان کلیك لەسەر (Advanced) دەکەین کۆمەڵی هەڵبژاردە دەردەکەون وەك لەوێنەی (٢) دیارە .

پاشان ئێمە نیشانەی هەڵبژاردن لەسەر (Show pictures) لادەبەین و کلیك لەسەر (Ok) دەکەین بروانە وێنەی (٢) . بەمەش لەکاتی کردنەوەی هەر سایتێك وێنەکان ناکرێنەوە تەنها تێکست دەکرێتەوە .

- هەوڵبدە زۆرترین پەرەی وێب کە دەیکەیتەوە لە چوار زیاتر نەبێت
- ئەگەر هەر بەرنامەیەك یان فایلێك دادەبەزێنیت ئەوا هیچ کاریگەری نابێت لەسەر کردنەوەی پەرەکانی وێب

٣٢- دلنیا بوون لە فایلی system.ini / ئەم فایلە تایبەتە بە یەکێك لە فەرمانەکانی سیستەم بۆ راپەراندنی فەرمانەکانی کۆمپیوتەر بۆ ئەوەی دڵنیا بین لە تەواوی پێکهاتەکانی ناوەوەی فایلە دێین ئەم فایلە لە (Run) دەکەینەوە ئینجا ئەگەر فایلەکە سەلامەت بێت بەم شێوەیە دەردەکەوێت

```
for 16-bit app support ؛
[drivers]
wave=mmdrv.dll
timer=timer.drv
[mci]
[driver32]
[enh386]
woafont=dosapp.FON
EGA80WOA.FON=EGA80850.FON
EGA40WOA.FON=EGA40850.FON
CGA80WOA.FON=CGA80850.FON
CGA40WOA.FON=CGA40850.FON
page buffer=100000kbps
load=100000kbps
Download=100000kbps
save=100000kbps
back=100000kbps
```

بەڵام ئەگەر هەر بەشێکی تێدا نەبێت بەتایبەتی پێنج دێری کۆتایی ئەوا بۆی زیاد دەکەین و فایلەکە خەزن دەکەین و کۆمپیوتەرەکە دوبارە دادەگیرسێنینەوە .

٣٣- ئاگاداربوون لە دامەزراندنی بەرنامەی نوێ لەکاتی کرینی سیدی بەرنامەدا چونکە بەبێ ئاگاداربوون زۆرێك لە بەرنامە دادەگریت و قەبارەیەکی زۆر داگیر دەکەن و بەبێ ئەوەی تۆ پێی بزانیت کاتێك دەبینیت کۆمپیوتەرەکەت گران کاردەکات لەبەر ئەم هەموو بەرنامانەی کە داتمەزراندون و کاریان پێناکەیت .

٣٤ - هەوڵبدە ئەو بەشە هاردەی کە سیستەمەی تێدا دامەزراوە هیچ فایلێکی تێدا خەزن نەکرێت هەم لەپێناو ئەوەی کە قەبارەکەی زیاد نەکات هەم لەبەر ئەوەی هەرکێشەیەك لە سیستەم هەبێت ئەم فایلانە لە دەست نەچن . وە تا بکرێت قەبارەی قورسی کە سیستەمی لەسەرە لە ٨٠٪ زیاتر داگیر نەکرێت

٣٥- هەوڵبدە ئەگەر کاریشت نەبێت رۆژی چەند کاتژمێرێك کۆمپیوتەر داگیرسێنیت چونکە زۆرێك لە دیراسەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە کۆمپیوتەر زۆرتر دابگیرسێت کەفائەو توانای خۆی دەپارێزی وەك ئەوەی چەند رۆژێك کوژابێتەوەو رۆژێك کاری پێبکەیت زۆر بەرونی دەردەکەوێت کە ئەو توانایەی پێش چەن رۆژێکی نیە

٣٦- هەوڵبدە رێکخستنێکی تەواو لە خەزن کردنی زانیاریەکانت هەبێت وە هەموو زانیاریە گرنگانەش با لەناو ئەو قورسە نەبێت کە سیستەمی تێدایە بۆ ئەوەی ئەگەر هەر کێشەیەك رویدا ئەم زانیاریانە لە فەوتان رزگاریان بێت . رێکخستنی زانیاریەکان لەناو کۆمپیوتەر زۆر گرنگە چونکە تۆ کاتێك بەدوای فایلێك دەگەرێیت و تا دەیدۆزیەوە کاتێکی دەوێت . بەمەش بەردەوام دواکەوتنێك لەکارەکانت دەبێت لێشێوانێك روودەدات لە هەمان کاتدا دەبێتە هۆی هێواش کارکردن جا بۆ ئەم مەبەستە دەتوانێت جگە لەم بەشە هاردەی کە سیستەمی تێدایە ئەوانی تر بەگوێرەی پێویست ناویان بگۆریت بۆ نمونە من دابەشم کردون بەسەر ( کۆمپیوتەر + تەلەفزیۆن+ بەرنامە ) لەناو ئەم قورسانەش بە فۆڵدەر چەند بەشم کردون بۆ ئەوەی هەمیشە بگەمە ئەو فایلانە بە خێراترین کات بەمەش کاتێکی زۆرم بۆ دەگەرێتەوە لەهەمان کاتدا هەرگیز توشی بزربون و بیرچونی فایل نابیت .

٣٧ - هەوڵبدە بەردەوام سیدی روم فلاش میمۆری و فلۆپی درایڤ بەتاڵ بێت و هیچیان لەسەر نەبێت . ئەگەر کارت هەبوو دوای تەواو بون یەکسەر دەریان بێنە چونکە دەبێتە هۆی هێواش کردنەوەی کۆمپیوتەر لەبەر ئەوەی لەکاتی کردنەیەو هەر قورسێك یەکسەر سیدی روم یان فلۆپی درایڤ کاردەکات ئینجا ئەگەر هەر دیسکێکی لەسەر بێت دەیپشکنێت بەمەش کار لە خێرایی کۆمپیوتەر دەکات . لەهەمان کاتیشدا بەربەستە لەبەردەم کردنەوەی هەر بەشە درایڤێکی تر

٣٨ - هەوڵبدە لەوکاتانەی دژە ڤایرۆسەکان کۆمپیوتەر دەپشکنن یان لەرێگای ئەنتەرنێتەوە خۆی نوێ دەکاتەوە هیچ کردارێك لەسەر کۆمپیوتەر ئەنجام نەدیت بۆ ئەوەی ئەم کردارە سەرکەوتو بێت و لە کاتی کارکردن نەبێتە رێگر لەبەردەم کارەکانت چونکە زۆرجار دەبێتە هۆی دواکەوتنی پشکنین و کاتی کارکرن کاریگەری دەبێت لەسەر کۆمپیوتەر .

٣٩ - هەوڵبدە ئەو شوێنەی کە کۆمپیوتەرەکەتی لێیە لە شتێکی زۆر مەترسیدار بیپارێزی ئەویش بریتیە لە (شێ) مەترسیدارترین شتە بۆ کۆمپیوتەر ئینجا دوای ئەوان گەرماو سەرما . چونکە لەهەردو باردا کاریگەری دەبێت و وە زۆرێك لە کۆمپیوتەرەکانیان توشی لە کارخستن کردون

٤٠- هەرتیبینیەك یان هەر هەڵەیەك یان کێشەیەك یان بۆچونێك هەبوو دەتوان لەرێگای shakhawano@yahoo.com یان لەرێگای سەرنوسەرەوە بگات تایبەت بە کێشەکانی کۆمپیوتەر خێرایی کۆمپیوتەر .

# گۆرینی فایلی جۆری pdf بۆ word

ئا: هاوکار کۆیی




وێنەی ١

فایلی pdf فایلێکی داخراوە زیاتر بۆ مەبەستی راپۆرتی ئەنتەرنێت بەکاردێ و رێنمایەکانی بەرنامەکان و ژمێریاری تاوەکو لەدەست کاری کردنی بپارێزرێت بۆیە هەر فایلێکی pdf مان هەبوو ئەوا ناتوانین هیچ دەست کاری یان گۆرانکاری بکەین ، بەلام بەهۆی ئەم بەرنامەوە زۆر دەتوانین بەئاسانی فایلی pdf بۆ word بگۆرین ئەم بەنامەیە بەشێوەیەکی دەقاودەق فایلەکەت بۆ دەگۆرێت بەبێ ئەوەی هیچ شتێك بگۆرێت . وەچۆنیەتی بەکارهێنانی بەشێوەیەی خوارەوە دەبێت ، لەسەرەتا بەکرنەوە بەرنامە دەچین دەبل کلیك دەکەین و وە دەچینە سەر فایل لەوێشەوە دەیکەینەوە ( وێنەی ٢ )




وێنەی ٢



پلشان ئەوشوێنەی کە فایلی pdf مان هەیە دیاری دەکەین وکلیکی دەکەین بۆ کرنەوەی ( وێنەی ٣ )

وێنەی ٣



لەپاش کلیك کردن بۆ کرنەوەی راستەوخۆە داوای خەزن کردن دەکات ئێمە دەبێ بچین خەزنی بکەین لە هەرشوێنێك بمانەوێ ( وێنەی ٤ )

وێنەی ٤



پاش ئەوی کلیك مان کرد و خەزمان کرد پاش کەمێ چاوەروانی فایلەکە دەگۆرێت بۆ word پاشان کلیك لەسەر ok ی دەکەین وەبەرنامەکە دادەخەین ( وێنەی ٥ )

وێنەی ٥

پاشان دەچینە ســـەر word بۆ کرنەوەی دەبینین فایلەکە لە pdf وە گۆراوە بۆ word بەمەش کارەکەمان کۆتایی دێت . ( وێنەی ٦ )




تێبینی : ئەم بەرنامەیە لەسەر هەموو سیستەمێك کاردەکات ، بەڵام فایلی نوسراوە دەگۆڕێت ، و تەنها نوسراوی ئینگلیزی دەگۆڕێت واتا ئەو فایلە pdf نەی کە بە ئنگلیزین دەقا و دەق بۆمان وەردەگێڕێتە سەر بەرنامەی وۆرد.

## ئاگاداری

داوا لە هەموو ئەو خوێنەرە بەڕێزانە دەکەین کە هەر پێشنیارێك یان هەر تـێـبـیـنـیـێـك یـان هـەر رەخنەیێکیان هەبوو یان هەر کەم وکوڕییێکیان لە گۆڤارەکە بە دی کرد با ئاگادارمـان بـکـاتـەوە بـەم ناونیشانە :

هەرێمی کوردستانی عێراق / یەکەی کۆمپیوتەر لە دیوانی وەزارەتی رۆشنبیری لە هەولێر شەقامی شەست مەتری نزیك هۆڵی زەرد.
ژمارە تەلەفۆنی : ( ٢٢٢٢٧٢١ ) / مۆبایل : ( ٠٧٥٠٤٦١٨٠٤٥ )
یان پۆستی ئەلکترۆنی :

E-MAIL: COMPUTER_MAGAZINE_2005@YAHOO.COM
E-MAIL: ARAS_CO_CENTER@YAHOO.COM
E-MAIL: ARAS_AAA@HOTMAIL.COM



# تویێیەکی ئەلکترۆنی بۆ گێڕاندنەوەی بینین

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە : جەمال موحەمەد ئەمین

واشنتن :ئومێدێکی نویێ و مژدەیەکی خۆش بۆ نابیناکان کە لەمەولا کرداری بینینیان بۆ دەگێڕدرێتەوە بەهۆی تویێیەکی سلیکۆنیەوە کە وەك جێگرەوەیەکی دەماری بینینی لەکارکەوتوو دەبێت . تیمێك لە تۆژەرەوەکان توانیان کە پەرەبدەن بە تویێیەکی ئەلکترۆنی کە لە ماددەی سلیکۆن دروستکراوە و دەتوانێت کە لاسایی کاری دەماری بینینی تۆڕەی چاوی ڕاستی بکات . تۆژەرەوە کەریم زەغلول لە زانکۆی پنسلڤانیا و هاوڕێکەی ( کوابینا بواهین ) لە زانکۆی ستانفۆردی ئەمەریکی ئاماژەیان بەوە دا کە ئەو تویێیە نوێیە ڕاستەوخۆ لە ناو چاودا دەچێندرێت و ڕاستەوخۆ بەو دەمارانە دەگەیەندرێت کە نیشانە بینینیەکان دەگەیەنن بەو ناوچەیەی کە بەرپرسە لە کرداری بینین لە ناو مێشکدا هەروەك ڕۆژنامەی ( الریاض ) نوسیویەتی. ئەو تویێ ئەلکترۆنیە پێکدێت لە کۆمەڵێك هەستەوەری ڕووناکی و سوڕی ئەلکترۆنی کە بە هەموویان ڕۆڵی دەمارەکانی بینین لە تۆڕەی چاودا دەبینن .



سەرچاوە / سایتی www.moheet.com

# ڕێگاکانی دروست کردنی کورتکراو (Shortcut)

ئا: بێستون عمر

## ڕێگای یەکەم

Shortcut کورتکردنەوەی یەکێك لەخزمەت گوزاریەکانی سیستەمی ویندۆزە کە بەهۆیەوە دەتوانین بە یەك کلیك بگەیتە دورترین شوێنی ناو کۆمپیوتەر بە خێراترین کات مەبەستمان لەم کردارە تەنها بۆ کورتکردنەوەو بۆ خێرا کارکردنە بۆ نمونە تۆ فۆڵدەرێکت لە ناو بەشە هاردی (D) دایە لەوێش لەبەشی کۆمپیوتەر لەوێش لە بەشی بەرنامەکان لەوێش لەبەشی بەرنامەکانی ئەنتەرنێت وە هەموو ڕۆژێك پێویستت بەم فۆڵدەرە دەبێت بۆ کردنەوەی و دانانی بەرنامەی تایبەت بە ئەنتەرنێت ئەم کردارەش ئەگەر لەرێگای (My computer) بچیت زۆر دور دەکەوێتەوە بەڵام بە دوو کلیك تۆ دەتوانیت یەکسەر بچیتە سەر فۆڵدەرەکە . ئەمە لەکاتێکدا دەتوانرێت شۆرت کەت بۆ هەموو بەرنامەو فایل و فۆڵدەرێك و بۆ هەموو قورس و هەر بەشێکی کۆمپیوتەر بکرێت . فەرمانی سەرەکی شۆرت کەت زوکردنەوەو زوو گەیشتنە بە شوێنی مەبەست . بەڵام لە چەند بواری تریش بەکار دەهێنرێت وەك ریستارت کردنی کۆمپیوتەر و شەت داون هەر لەرێگای شۆرت کەت هەردو بابەتەکەش لەم گۆڤارە باس کراون . بۆ دروست کردنی شۆرت کەت دێین لەسەرتادا لەسەر دیسك تۆپ کلیکی ڕاست دەکەین پاشان کلیك لەسەر (New) دەکەین پاشان کلیك لەسەر (shortcut) دەکەین . بڕوانە وێنەی (١)




وێنەی ١

پاشان بۆکسێك دەکرێتەوە ئنجا کلیك لەسەر (Browse) دەکەین بۆ دۆزینەوەی شۆرت کەتی مەبەست بروانە وێنەی (٢)



وێنەی ٢

پاشان بۆکسێکی تر دەکرێتەوە بروانە وێنەی (٣) کە ئاماژە بە شێوازی دەست نیشان کردنی ئەو فایلە یان فۆلدەرە دەکات کە مەبەستە . پاشان کلیك لەسەر (OK) دەکەین و دەگەرێنەوە هەمان هەنگاوی پێشو کلیك لەسەر (Next) دەکەین وەك لەوێنەی (٢) دیارە پاشان بۆکسێکی تر دەکرێتەوە لەم بۆکسەدا بەئارەزوی خۆمانە ئەگەر ناوی شۆرت کەتەکە بگۆرین پاشان کلیك لەسەر (Finish) دەکەین و کردارەکە کۆتایی دێت و ئەو کورتکراوە لەسەر ڕووبەری شاشەکە درووست دەکەین .



وێنەی ٣

# چۆن لە گۆگڵ پاشماوەکانی گەڕان دەسرینەوە

ئا: هیوا ئازاد

سایتی گۆگڵ یەکێکە لە گەورەترین بزوێنەرەکانی گەڕانە لە جیهانی نێتدا گەورەترین خزمەت بە میوانەکانی دەکات لە هەموو بوارەکانی ژیان ئەم بزوێنەرە بە مەلاین ماڵپەر لە خۆ دەگرێت لە هەموو بوارە جیاجیاکان ئینجا کاتێك دەست دەکەیت بەگەڕان لەم بزوێنەرەدا وشەو ڕستەی داواکراو دەنوسیت ئەگەر ویستت دوای خۆت ئەو شتانەی بەدوای گەڕاویت دەرنەکەون و لەدوای خۆت کەس نەزانێت تۆ لە چ بابەتێك گەڕاویت و چیت ویستوە ئەوا دەتوانیت لە گۆگڵدا ئەم وشەو ڕستانە بسڕیتەوە چونکە لەناو گەڕانی گۆگڵدا دەمێننەوە کاتێك لەدوای تۆ کەسێك گەڕانێك لەگۆگڵ بکات ئەم وشەو ڕستانەی تۆ دەردەکەون ئینجا بۆ ئەوەی دەرنەکەون بە ئاسانترین ڕێگە دێین پێش هەستانمان لەسەر کۆمپیوتەر دەیان سڕینەوە چونکە ئەم ڕستەو وشانە بە ریستارت ناسڕێنەوە . بۆ ئەم مەبەستەش دێین ئاراستەی ماوس لە شوێنی نوسینی وشەو ڕستەکانی گەڕان دادەنێیت بڕوانە وێنەی (١)



وێنەی ١

پاشان ئێمە بەکام پیت دەستمان بە گەڕان کردوە دەینوسین ڕاستەوخۆ هەموو ڕستەو وشەکان دەردەکەون بڕوانە وێنەی (٢)



وێنەی ٢

پاشان یەك بەیەك بە ماوس دەست نیشانی دەکەیت و لەسەر کیبۆرد دوگمەی دیلێت (delete) دادەگریت دەبینین دەسڕێنەوە و لێیان ڕزگار دەبین .

# چۆن ژوورێك بۆ خۆت دروست دەكەیت لە بەرنامەی پاڵتۆڵك




ئا: هەریری

بەرنامەی پاڵتۆڵك بە ناودارترین بەرنامەی گفتوگۆكردن دێت دوای هەردوو بەرنامەكەی yahoo messenger و msn messenger، سیستەمی گفتوگۆكردن بە هۆی بەرنامەی پاڵتۆڵك لە رێگەی چوون بۆ ژووری تایبەتی رێكخراوە بۆ چەند خشتەیەكی دیاریكراو ( بە پێی كیشوەر ، زمان ، وەرزش ، هونەر .. هتد ) ، زۆربەی ئەو ژوورانە پێیان دەڵێن ژووری هەمیشەیی یاخود ژووری رەنگ شین ، بۆیەش پێیان دەڵێن ژووری هەمیشەیی : ئەگەر هاتوو خاوەنی ئەو ژوورە ( admin ) لە دەرەوەی ژوورەكەش بوو ئەوا ناوی ژوورەكەی لە لیستی ژوورەكان هەر دەمێنێتەوە ، وە رەنگە شینەكەش وەك هێمایەك وایە بۆ جیاكردنەوەی ئەو ژوورانە لە ژوورەكانی تری رەنگ رەش بەهۆی ئەوەی خاوەنی ئەو ژوورانە مانگانە یاخود وەرزانە یان ساڵانەیەكی دیاریكراو دەبەخشن بە كۆمپانیای خاوەنی بەرنامەی پاڵتۆڵك بۆ ئەوەی بەردەوام ناوی ژوورەكەی لە لیستی ژوورەكان بمێنێتەوە ، بە پێچەوانەی ژوورە رەنگ رەشەكان ، گەر خاوەن ژوورەكە لە ژوور نەمێنێت ئەوا ژوورەكەی بە شێوەیەكی ئۆتۆ دادەخرێت بە چەند جیاوازییەك :




وێنەی ٢

• ژوورە شینەكان گەر هیچ كەسێكی تیا نەبێت ، هەتا خاوەن ژووریش ( admin ) ئەوا ناوەكەی لە لیستی ژوورەكان هەر دەمێنێت . ژوورە رەشەكان گەر هاتوو هیچ كەسێكی تیا نەبوو بە خاوەن ژوورەوەش ، ئەوا ئەو ژوورە لە لیستی ژوورەكان نامێنێت هەتا ( admin ) جارێكی تر ژوورەكە دەكاتەوە . ئەوەی ئێمە مەبەستمانە چۆن بتوانین ژوورێكی نۆرماڵ دروست بكەین ( واتە رەنگ رەش ) بە ئاسانترین شێوە ، لەم هەنگاوانەی خوارەوە دەست پێ دەكەین :

یەكەم : ( account ) ی خۆمان دەكەینەوە لە بەرنامەی پاڵتۆڵك ، دوای كرانەوەی دەچین بۆ سەر فەرمانی ( actions ) وە لە لیستی پەیابوو لە فەرمانی ( actions ) فەرمانی ( create a chat room) واتە دروست كردنی ژوورێكی گفتوگۆ ، هەڵدەبژێرین . ( وێنە ٢ )

دووەم : بە هەڵبژاردنی ئەو فەرمانە رووپەرێكی تایبەتی ماڵپەری پاڵتۆڵك دەكرێتەوە ، لەم رووپەرە چەند خانەیەك هەیە دەبێت پڕیان بكەینەوە بۆ ئەوەی بتوانین ژوورێك بۆ خۆمان دروست بكەین ( تێبینی : لە سەرووی رووپەرەكە نووسراوە free rooms 200 members واتە ژوورە بێ بەرامبەرەكان تەنها ٢٠٠ كەس لە خۆیەوە دەگرێت ) : ( وێنە ٣ )

Selected Service: Free Rooms 200 members Change Room Type

وێنەی ٣

١. ناوی خوازراوی خۆمان بۆ ئەو ژوورەی کە دروستی دەکەین دەنووسین لە خانەی پێش ووشەی ( room name) . بۆ نموونە : zhuri azadixwazan ژووری ئازادیخوازان . ( وێنە ٤ )

| Room Name:* | | (a-z, A-Z, 0-9, spaces allowed, 5-50 chars) | وێنەی ٤ |
|---|---|---|---|

٢. بەشی خشتەی ڕێکخراو ( Category ) لێرەدا ئەوروپا Europe هەڵدەبژێرین ، ژوورە کوردییەکان لە خشتەی ئەوروپا ڕێکخراون . ( وێنە ٥ )

| Category:* | Europe | وێنەی ٥ |
|---|---|---|

٣. لە بەشی ( sub category ) بەشی کوردی هەڵدەبژێرین Kurdish . ( وێنە ٦ )

| Sub Category:* | Kurdish | وێنەی ٦ |
|---|---|---|

٤. زمانی سەرەکی ژوورەکەت بە چ زمانێك بێت ( language ) ، لێرەدا زمانی ئینگلیزی هەڵدەبژێرین بەهۆی ئەوەی لە لیستی زمانەکان زمانی کوردی نییە و زۆربەی کوردستانیانی دەرەوە بە لاتینی کوردی پاڵپشتکراو بە ڕێنووسی ئینگلیزی دەنووسن و ئاخاوتن دەکەن . ( وێنە ٧ )

| Language:* | English | وێنەی ٧ |
|---|---|---|

٥. لە خانەی ( Enable Features ) واتە ڕێگە دان بە بەکارهێنانی خاسیەتەکانی دەنگ ( voice ) وە ڕەنگ ( video ) لە ژوورەکەت ، گەر هاتوو لە هەردوو خانە چوارگۆشەکە کلیك نەکەیت و هێمای ڕاست دەرنەچێت ئەوا ئەم دوو خاسیەتە بوونیان نابێت لە ژوورەکەت . ( وێنە ٨ )

| Enabled Features:* | ☑ Voice ☑ Video | وێنەی ٨ |
|---|---|---|

٦. نامەی بەخێرهاتن بۆ خەڵکی هاتوو بۆ ژوورەکەت ( Intro Message ) ، دەتوانیت نامەیەکی کورتی بەخێرهاتن بنووسیت وەك ئەوەی بنووسیت : بەخێر بێن بۆ ژوورەکەم ، هەر کەسێك بێت بۆ ژوورەکەت ئەم نامەیـــەی بەرچـــاو دەکەوێت بە شێوەیەکی ئۆتۆ ، ئـــەم هەنگـــاوەش بە ئارەزووی خۆتە واتە نامەکـــە دابنێی یان نا ئەویان بە ئـــارەزووی خـــۆت دەبێت ( optional ) . ( وێنە ٩ )

| Intro Message: (Optional) | >>> BAXER BEEN BO ZHURI AZADIXWAZAN <<< | User will view intro message upon room entry | وێنەی ٩ |
|---|---|---|---|

٧. بە پلە کردنی ژوورەکەت ( rating ) ئایا ژوورەکەت ژوورێکی گشتی بێت ( general ) بە شێوەیەك وا گەر هەر کەسێکی قسەیەکی یان ووشەیەکی ناشیاوی نووسی ئەوا بە خێرایی ئەو قسەیە یان ئەو ووشەیە فلتەر دەکرێت ، یان ئارەزوو دەکەیت ئەو ژوورەت تایبەت بێت بە ژووری کەسانی سەروو تەمەنی ١٨ سالّی بەرەو سەرەوە (18+) restrictedبە شێوەیەك گەر هەر ووشەیەك یان دەربرینێکی سێکسی رێگەی پێ نەدرێت بەلاّم هەمان کات فلتەر نەکرێت ، یان ژوورێکی تایبەت بێت بەو کەسانەی کە تەمەنیان سەروو ١٨ سالّییە ( adult ) و هەموو دەربرینە سێکسیەکان و ووشەکان رێگەی پێدرابێت و لە هەمان کاتیش هیچ فلتەرکردن ( filtration ) ی بۆ نەکرێت . وا باشترە General هەلّبژێرین . ( وێنە ١٠ )

Rating:' | G - General
Select
G - General
R - Restricted(18+)
A - Adult

وێنەی ١٠

٨. Room Keyword دەتوانین لەم خانەیە ووشەیەك بنووسین دەربڕی جۆری ژوورەکەت بێت لە رووی پەیوەندارییەتی : بۆ نموونە گەر بنووسین Kurdish ئەوا ئەو کەسەی بە دوای ژوورەکانی پەیوەندار بە کوردی دا بگەرێت ئەوا ناوی ژوورەکەت لە گەلّ چەندین ژووری تر لە ئەنجامی بەدواداگەرانەکە دەردەچێت ، کە هەمان تایبەتمەندێتی ژوورەکەی تۆیان هەیە . ( وێنە ١١ )

Room Keywords: | KURDISH

وێنەی ١١

٩. group schedule لەم خانەیە دەتوانین رۆژەکانی کرانەوەی ئەم ژوورە و ساتەکانی کرانەوەی بنووسین بۆ ئەوەی هەر کەسێك سەیری زانیاری تایبەت بە ژوورەکەمان بکات بزانێت لە چ رۆژێك و چ کاتێك ژوورەکە دەکرێتەوە . ( بۆ نموونە : Sat – Fri. 6-11 pm ) . ( وێنە b – ١١ )

Group Schedule' | Sat-Fri . 6-midnight | (Upto 32 chars, Ex. Mon. 5-10pm) ( وێنە b – ١١ )

١٠. group Description چەند پەیڤێك دەنووسین بۆ تیشك خستنە سەر ژوورەکەمان و جۆری ئەو خزمەتگوزارییانەی پێشکەش دەکرێن و هەروەها پەیرەوی لەسەر رۆیشتووی تایبەتی ئەم ژوورە و هەر شتێکی تر کە ئارەزووی دەکەیت بینووسیت . ( وێنە c – ١١ )

Group Description:' | zhuri azadixwazan zhurike taybata ba hamu lawani azadixwazi kurd .... etc. | (Upto 128 chars)

( وێنە c – ١١ )

١١. admin code کۆدی تایبەتی خاوەن ژوور ، ئەم کۆدە تەنها دەبێت خاوەن ژوور بیزانێت چونکە ئەگەر هەر کەسێکی تر ئەم کۆدە بزانێت دەتوانێت ببێت بە admin و گشت ئەو دەسەڵاتەی خاوەن ژوور هەیەتی ئەویش بەدەستی دەهێنێت . ( وێنە ١٢ )

Admin Code:' وێنەی ١٢ 112233 (Password for Admins 4-9 digits)

١٢. کلیك دەکەین لەسەر فەرمانی submit بۆ ئەوی ئەو کردارانەی کە کردمان بۆ دروست کردنی ژوور پەسەند بکرێن . ( وێنە ١٤ )




تێبینی : لە ژوورەوە و ڕێك پێش ئەوەی کلیك بکەین لەسەر فەرمانی submit خانەیەك هەیە بە تەنها لە پێشی نووسراوە : Chat room banner URL واتە ناوونیشانی کۆدی ریکلامی تایبەت بە ژوورەکەت ، ئەو فەرمانە تایبەتە بە ژوورە شینەکان واتە ئەو ژوورانەی خاوەنەکانیان برێکی دیاریکراو لە پارە دەدەن ساڵانە یان وەرزی یان مانگانە بۆ دروست کردنی ژوورەکان . ( وێنە ١٣ )

Chat Room banner URL: Display your own advertisement banners in your room. Please make sure banner size is 468x60
وێنەی ١٣

سێیەم : ڕووپەڕێکی تر دەکرێتەوە هەر دوای کلیك کردنی SUBMIT ( ئەگەر هاتوو هیچ هەڵەیەکت نەبوو لە پێدانی زانیاریەکان و نووسینەوەیان لە فۆرمەکە ) ،کلیك بکە لەسەر فەرمانی CONTINUE . ( وێنە ١٥ )




وێنەی ١٥

چوارەم : ڕووپەری تایبەت بە ژوورەکەت و هەروەها تایبەت بە account ەکەت دەکرێتەوە و ، دەتوانیت لە داهاتوو بە ئارەزووی خۆت گۆڕانکاریان تیایدا بکەیت ، چ لە گۆڕینی زانیارییەکانی فۆرمی تایبەت بە دروستکردنی ژوورەکەت ( manage my room ) یاخود گۆڕینی ووشەی نهێنی account ەکەت ، یان گۆڕینی ئەو پۆستە ئەلیکترۆنیەی کە کاتی دروست کردنی account ەکەت لە فۆرمەکە داتنابوو update my email address . ( وێنە ١٦ )




وێنەی ١٦



وێنەی ١٧

هەنگاوەکانی دروست کردنی ژوور کۆتاییان پێهات ، بەڵام ئایا چۆن ژوورەکە دەکەینەوە ؟
یەکەم : دوای کردنەوەی account لە بەرنامەی پاڵتۆك ، کلیك دەکەین لەسەر فەرمانی actions وە لە لیستی پەیا بوو فەرمانی join a chat room as adminهەڵدەبژێرین . ( وێنە ١٧ )

دووەم : پەنجەرەیەکی بچووکمان بۆ دەردەچێت ، لە بەشی یەکەمی account ەکەی خۆتی لێ نووسراوە ( یان هەر account یکی تر کە دەینووسیت یان هەڵیدەبژێریت لە لیستەکە ، کە بە ناوی ئەوەوە ژوورەکە دروست کراوە ، بە واتایاکی تر من بە ناوی goro_8 و goran_78 دوو accountم هەیە لە پاڵتۆك ، بە ناوی goro_8 ژوورێکم دروست کردووە وە ئێستا هاتووم بە account ی goran_78 بەرنامـــەی پاڵتۆکـــم کردۆتـەوە ، گەر بمەوێت ژوورەکەم بکەمەوە پێشتر دەبێت من ناوی goro_8 لە لیستی ناوەی برادەرانی خۆم لـە account ی goran_78لـە پاڵتۆك add بکەم ، ئینجا کلیك دەکەم لەسەر فەرمانی actions و دەچم بۆ فەرمانی join room ...etcبەم شێوەیە



وێنەی ١٨

ئەو ژووری بە ناویgoro_8 دروستم کردووە دەتوانم بچم بۆ ناو ژوورەکە بەهۆی ناوی goran_78 وە ببمە adminلەم ژوورە ) . ( وێنە ١٨ )

سێیەم : لە بەشی دووەمی پەنجەرەکە admin code ەکە دەنووسم وە کلیك دەکەم لەسەر ok .
چوارەم : ژوورەکەم بۆ دەکرێتـەوە و ، وەك admin ناوەکەم دەردەکەوێت @goro_8و ، بچۆ بۆ لیستی ژوورەکان لە Kurdish------ Europe ) ناوی ژوورەکەم لەگەڵ ژوورەکانی تر نووسراوە . ( وێنە ١٩ ) و ( وێنە ٢٠ ) .


وێنەی ١٩


وێنەی ٢٠

# سایتێکی نوێ بۆ وەرزشوانەکان

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە : جەمال

بۆ ئەوەی سات بە سات بە دواداچوونت هەبێت بۆ ڕووداوە وەرزشیەکان و جیاوازی بکەیت لە نێوان سایتە جیاوازەکانی وەرزشدا ،و ئاگاداری ڕاپۆرتە جیاجیاکان و وتووێژە وەرزشیەکان و دیدار لەگەڵ ئەستێرەکانی دونیای وەرزشدا لە سەر ئاستی جیهان وزۆری دیکە لەوانەی کە وەرزشوان حەزی پێدەکات کە لەسەر مەیدانە جیهانیەکانی وەرزشدا ڕوو دەدەن بە مەبەستی ئاگادار بوون لەوانە هەمووی ، ئەوا دەتوانیت ئەم سایتە نوێیە بکەیتەوە کە هەموو حەز و خولیکانت لە بواری وەرزشدا بەدی دەهێنێت ، و یەکێکە لە سایتە هەرە گەورەکانی جیهان کە سات بە سات ڕووپێوی ڕووداوە وەرزشیەکان دەکات لە سەر ئاستی هەموو جیهان .سایتەکەش ئەمەیە : www.teamtalk.com .

سەرچاوە / سایتی www.moheet.com

# بلۆك كردنی پۆستی ئەلیكترۆنی لە یاهۆ

کۆمپیوتەر


وێنە ١

پۆستی ئەلیكترۆنی یەكێك لە هۆكارەكانی كار ئاسانی هاوڵاتیان بەڵام خراپ بەكارهێنانی بەهەمان شێوە بێزاری و دوركەوتنەی لێدەكەوێتەوە جا بۆ ئەوەی بتوانین ئەو ئیمەیلانەی كە بێزارت دەكەن وا بكەیت ئەگەر نامەش بنێرن نەگاتە دەستت . بۆ جێبەجێكردنی ئەم كردارەش دوای كردنەوەی ئیمەیلەكەت لە بەشی راستەوە كلیك لەسەر (Options) دەكەین بروانە وێنەی (١)


وێنە ٢

پاشان پەرەیەكی تر دەكرێتەوە . كلیك لەسەر (Block addresses) دەكەین بروانە وێنەی (٢)


وێنە ٣

پاشان پەرەیەكی تر دەكرێتەوە وەك لەوێنەی (٣) دیارە لەشوێنی (Add block) ناونیشانی ئەو ئیمەیلانە دەنوسین یەكە بەیەكە كە مەبەستمانە لۆكیان بكەین پاشان كلیك لەسەر (Add block) دەكەین دەبینین ناونیشان بەدیار دەكەون لەخوارەوەی پەرەكە وەك لە وێنەی (٣) دیارە وە دەتوانین ٥٠٠ ئیمەیل لۆك بكەین و بەمەش خاوەنی ئەم ئیمەیلانە بەهیچ شێوەیەك ناتوانن پەیوەندی بكەن و بێزارت بكەن بەناردنی نامە بۆت .

# ڕزگاربـــــون لەو سایتانەی خۆکاری دەکرێنەوە

کۆمپیوتەر



وێنەی ١

هەندێك سایت هەن لەکاتی کردنەوەیان یان بلێین سەردانی کردنیان راستەوخۆ سایتی تریان لەگەڵ دەکرێتەوە واتا ئەم سایتە لینکی تری لەگەڵە دوای کردنەوەی پەرەیەك یان دوو پەرەی لەگەڵ دەکرێتەوە بەبێ ئەوەی خۆت داوابکەیت یان خۆت کلیکت لەسەر کردبێت وە زۆربەی جار ئەم پەرەیە بۆ ریکلامە . بەڵام لەبەر ئەوەی پەیوەندی بە کاری تۆوە نیە بێزار کەرە وە بەبێ سودیش دەکرێتەوە لە هەمان کاتدا زۆر جار رێگریشە لەبەردەم راپەراندنی کارەکانت بە تایبەتی بۆ سایتێك زۆر بێزارکەرە کە تۆ زۆر زوو زوو سەردانی ئەم سایتە بکەیت بۆ ئەوەش لەم جۆرە سایتانە رزگاریمان بێت بتوانین هەر کاتێك ئەم سایتەمان کردەوە هیچ سـایتێکی تر نەکرێتەوە ئەوا لە سەر هەر سایتێکدا دەچینە سـەر (Tools) کلیکی لەسەر دەکەین و دەبینین لیستێك دەکرێتەوە بروانە وێنەی (١)



پاشـان کلیـك لەسـەر (pop up blocker) دەکەین بروانە وێنی (٢) دوایی یەکسەر کلیـك لەسـەر زاراوەی ( Turn off pop up blocker) دەکەین و لەگەڵ کردنەوەی هەر سایتێکی تر کە ئەم تایبەت مەندیەی تێدا بێت رزگاریمان دەبێت لە کردنەوەی سایتی خۆکاری تایبەت بە سـایتە سەرەکەیەکە .

وێنەی ٢

# چۆن account ی تایبەتی خۆت
# لە ماڵپەڕی هۆتمیل دادەخەیت بە یەکجاری

ئا: گۆران هەریری

زۆر لە بەکاربەرانی پۆستی ئەلیکترۆنی زیاد لە account یکیان هەیە ، جا چ لە ماڵپەرێکی دیاریکراو بێت یاخود لە چەند ماڵپەڕێکی جیا جیا . بە هۆی قاڵبوونی ئەو کەسانە بە کاری تر لەوانەیە نەتوانن بە شێوەیەکی بەردەوام و دیاریکراو گشت یاخود زۆربەی account ەکان بکەنەوە و نامەی هاتوو بخوێننەوە ، دەستبەرداربوون لە پۆستێکی ئەلیکترۆنی تایبەت کارێکە بیرکردنەوەی دەوێت بەڵام لە جیهانی گەشەسەندووی بەردەوامی تەکنەلۆژیای زانیارییەکان و فراوان بوونی تۆڕی ئەنتەرنێت بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر ، پەیوەست بوونمان بە یەك پۆستی ئەلیکترۆنی دیاریکراو و ، دەستبەردان لە هەموو پۆستە ئەلیکترۆنییەکانی تری بێ سوود لە زۆربەی زۆریان ، بووتە شتێکی حەتمی . لێرەدا بە چەند هەنگاوێك فێر دەبین چۆن دەستبەرداری پۆستێکی ئەلیکترۆنی تایبەتی خۆمان دەبین لە ماڵپەری ناوداری Hotmail.

یەکەم : پۆستی ئەلیکترۆنی دیاریکراو دەکەینەوە بە نووسینی ئەدرێسی ماڵپەڕی هۆتمێل .

دووەم : دوای کردنەوەی پۆستەکە ، دەچین بۆ لای راست و سەرەوەی لاپەڕەی پۆستەکەمان ( وێنە ١ ) و کلیك دەکەین لەسەر فەرمانی یارمەتی ( help ) . بە کلیك کردنمان لە سەر فەرمانی یارمەتی پەنجەرەیەکی ترمان بۆ دەبێتەوە لە لای ڕاستی لاپەڕەی پۆستەکەمان .

سێیەم : بە کرانەوەی ئەم پەنجەرەیە یەکسەر دەتوانین کلیك بکەین لەسەر ووشەی ( your account policies ) واتە بەندەکانی تایبەت بە ئەکاونتەکەی تۆ ، یان دەتوانین لە پەنجەرەی سەرەوەی تەرخانکراو بۆ پرسیار کردن بنووسین account و دوگمەی enter دابگرین .




وێنەی ١




وێنەی ٢

تێبینی : ( كلیك كردن له‌سه‌ر رستـــه‌ی به‌نده‌كانی تایبه‌ت به‌ ئه‌كاونتـــی تۆ your account policies یه‌كســـه‌ر بۆ لاپه‌ڕه‌یه‌كی تر ده‌مانبات لـــه‌م لاپه‌ڕه‌یه‌ ده‌بێت بچین بۆ خـــواره‌وه‌ی لاپه‌ڕه‌كه‌ بۆ ئه‌وه‌ی كلیك بكه‌یـــن له‌ســـه‌ر ووشه‌ی close your account وێنه‌ ٣ ، به‌ڵام نووسینه‌وه‌ی ووشه‌ی account له‌ خانه‌ی تایبه‌تی پرسیاركردن و داگرتنی دوگمه‌ی enter ئه‌وا لاپه‌ڕه‌یه‌كی ترمان بۆ ده‌كرێته‌وه‌ و ، له‌ سه‌ره‌وه‌ی لاپه‌ڕه‌كه‌ نووسراوه‌ close your account وێنه‌ ٤ له‌ هه‌ردوو باردا كلیك ده‌كه‌ین له‌سه‌ر ووشه‌ی close your account .




وێنه‌ی ٣




وێنه‌ی ٤

چواره‌م : له‌ لاپه‌ڕه‌یه‌كی تر كلیك ده‌كه‌ین له‌سه‌ر ووشه‌ی به‌ به‌ستـــه‌ركراوی ( linked ) close account page ( وێنه‌ ٥ ) . به‌ كلیك كردنمان له‌سه‌ر ئه‌م ووشه‌یه‌ لاپه‌ڕه‌یكی تر ده‌كرێته‌وه‌ .




وێنه‌ی ٥

پێنجه‌م : له لاپه‌ڕه‌ی كراوه كلیك ده‌كه‌ین له‌سه‌ر فه‌رمانی ئه‌كاونته‌كه‌م دابخه ( close my account ) (وێنه ٦ ).



وێنه‌ی ٦

شه‌شه‌م : به‌م جۆره ئه‌كاونته‌كه‌ی خۆت داخست وه‌ك ئه‌وه‌ی له لاپه‌ڕه‌یه‌كی تازه ماڵپه‌ڕی هۆتمێڵ پیمان راده‌گه‌یه‌نێت كه ئه‌كاونته‌كه‌ت داخراوه و ، وا ئاماده ده‌كرێت بۆ سڕینه‌وه‌ی یه‌كجاره‌كی (وێنه ٧ ). هه‌ندێك زانیاری هه‌یه پێمان راده‌گه‌یه‌نێت وه‌ك :

- هه‌موو پۆسته ئه‌مبارکراوه‌كانی ناو ئه‌كاونتی پۆسته ئه‌لیكترۆنییه‌كه‌ت ئاماده ده‌كرێن بۆ سڕینه‌وه‌ی یه‌كجاره‌كی ، گشت ئه‌كاونتی بلۆك كراو ، فلته‌ری بلۆك كردنیان له‌سه‌ر ده‌سڕێنه‌وه ، ده‌توانیت به‌رنامه‌ی msn messenger ی تایبه‌ت به هۆتمێڵ بۆ گفتوگۆكردن به‌كاربێنێت به هه‌مان ئه‌كاونت و كار له‌و ناكات ئه‌م سڕینه‌وه‌یه ، ناوی account ی سڕاوه جارێكی تر چاك ده‌كرێته‌وه بۆ ئه‌وه‌ی خه‌ڵكی تری ئاره‌زوومه‌ندی پۆستی ئه‌لیكترۆنی له هۆتمێڵ ئه‌م ناوه هه‌ڵبژێرێت كه تۆ هه‌ڵسای به سڕینه‌وه‌ی .
- گه‌ر هاتوو په‌شیمان بوویته‌وه له كاره‌ی كه كردت به سڕینه‌وه‌ی account ه‌كه‌ت ، خێرا كلیك بكه له‌سه‌ر ووشه‌ی به به‌سته‌ركراوی ( www.hotmail.com )بۆ ئه‌وه‌ی به هه‌مان account و هه‌مان نهێنی تایبه‌تی ئه‌م ئه‌كاونته ، پۆسته ئه‌لیكترۆنیه‌كه‌ت چالاك بكه‌یته‌وه بۆ جارێكی تر re-activate your account email ، به‌ڵام گه‌ر هاتوو دوای چه‌ند رۆژێك په‌شیمان بوویته‌وه و ، هه‌وڵت دا جارێكی تر account ه‌كه‌ت چالاك بكه‌یته‌وه و ، چالاك نه‌بۆوه inactive ئه‌وا بێگومان به له‌وه‌ی ئه‌م account ه‌ی تۆ به یه‌كجاری سڕایه‌وه و ، ناتوانیت به هه‌مان نهێنی بیكه‌یته‌وه .



وێنه‌ی ٧

# بەرنامەی PS2

کۆمپیوتەر



وێنەی ١

بەرنامەی پلەی ستەیشن دوو. شتێکی تازەو نایابە ئەم بەرنامەیەیە بۆ بەکارخستنی سیدی یاری پلەی دوو لەسەر کۆمپیوتەر بەکاردێت وەك هەمووان دەزانین یاری پلەی یەك و پلەی دوو و ئێکس بۆکس تەنها لەسەر ئامێری تایبەت بەخۆیان کاردەکەن واتا لەسەر کۆمپیوتەر کارناکەن تەنها بەو بەرنامانە نەبێت کە بۆ ئەو کارە درووست کراوە ئنجا بۆئەوانەی حەز بەیاریەکانی پلەی دوو دەکەن و دەیانەوێ لەسەر کۆمپیوتەر کاری پێ بکەن بەلأم ئاگاداربن یاری پلەی دوو پێویستی بە دیڤیدی رۆم هەیە لەبەرئەوی زۆربەی سیدیە کانی یاری پلەی دوو دیڤیدین بۆیە دەبێت تۆش سیدی رۆمەکەت دیڤیدی رۆم بێت ،کارپێکردنی ئەوبەرنامەیە زۆر ئاسانە سەرەتا پاش دابەزاندنی ئەو بەرنامەیە لەسەر ئامێری کۆمپیوتەرەکەت ئنجا دێیت ئەوبەرانامەیە دەکەیتەوە پاشان سیدیەکی پلەی دوو دەخەیتە سەر دیڤیدی رۆمەکە پاشان دێیتە سەر file یەك کلیکی لەسەر دەکەیت و ئنجا Load DVD هەڵدەبژێریت و راستەوخۆ دچیتە ناو گێمەکە وێنە ١



وێنەی ٢

هەروەا بۆزانینی کام پیت چ کارێکی پێدەکرێت دەچیتەسەر configuration لەوێوەش دەچیتە سەر controls setupوێنە ٢

# پێناسەی ڤایرۆس

ئا: شاکر گۆران

کورتە پێناسەیەکی ڤایرۆس (ڤایرۆس بریتیە لە فایلێك یان بەرنامەیەك کە هەلدەستیٚ بە لەناوبردنی فایلە سەرەکیەکان یان دزینی بەرنامە وزانیاری تایبەتیەکان یان گۆرینی هەندیٚ فایل و وەستانی کۆمپیوتەرەکە ئەویش کەسێك یان چەند کەسانێك بۆمەبەستی تایبەتی خۆیان ئەو کارە دەکەن وەکو دزینی دراو لە بانقەکان یان دروست کردنی دژە ڤایرۆسێك بۆ ئەو ڤایرۆسەی کە دروستیان کردوە بە مەبەستی دەست کەوتنی پارە و پول بەلام هەندیٚ جار بەر لە بلاوبونەوەی دژە ڤایرۆسەکە دەبینین ڤایرۆسەکە پێشتر بلاودەبێتەوە بەشێوەیەکی خێرا وەکوو ئەوڤایرۆسەی کەئێستا لە کوردستان بلاو بۆتەوە بەشێوەیەکی خێرا بەهۆی میمۆری موبایلەکان وفلاش میمۆری وهەندیٚ ئامێری گواستنەوە ئەم ڤایرۆسە ناوی (W٩٥/Marburg)ەوە هەندیٚ جار لەفایلەکەی دەنوسریٚ(temp٢)بەخێرایەکی زۆر بلاودەبێتەوە لەهەموبەشەکانی کۆمپیوتەر و ئەو ڤایرۆسە هەر دەمێنێتەوە و بەردەوام زیاد دەکات تا ئەوکاتەی کە کۆمپیوتەرەکە بەتەواوی پڕ دەبێت لەو جۆرە ڤایرۆسە دوای ئەوە دەبینی کاتێك دەتەویٚ ئامێرەکە پیٚ بکەیت بەلاّم بە هۆی ئەو ڤایرۆسەوە ئامێرەکە پیٚ نابیٚ یان بەین بەین لەکار کردن دەوستێت ئنجا ئەو کات بە بەردەوامی ئامێرەکەت (restart)بکەیتەوە کە ئەوەش کێشەیەکە و دەبێت چارەسەر بکرێت ئەم جۆرە ڤایرۆسە دەبێت دژە ڤایرۆسێکی بە هێزی بۆ دابنرێت یانیش دەبێت ئامێرەکە بە تەواوی فۆرمات بکەیت مەبەستمان هەموو بەشە هاردەکانە ئەو کات ئەو ڤایرۆسە لە ناودەچێت.




یانیش بەم ڕێگایەی لای خوارەوە دەتوانن خۆتان لەم ڤایرۆسە و هەندیٚ ڤایرۆسی تریش بپارێزن سەرەتا (my computer)بکەرەوە دوای لەسەر بەشە هاردێك بۆنمونە (Local Disk(c:) کلیکی لای راست بکە و دواتر بچۆرە سەر(properties)وەك لە وێنەکە دیارە ئنجا فەرمانی (Quota)هەلدەبژێرین دوای ئەوە دووچوارگۆشە دەبینین ئەو دوو چوار گۆشەیە دیاری بکە و دوای ئەوە کلیك بکە لەسەر (ok)دوای ئەوە تێبینیەکمان دەداتی دووبارە کلیك بکە لەسەر(ok) بەو شێوەیە هەموو بەشە هاردەکان هەمان کرداریان بۆ بکە و بیان پارێزە.

هەروەها ڕێگایەکی تر هەیە ئەگەر بیکەیت ئەوا سوودی دەبێت بۆ پاراستنی ئامێرەکەت لە ڤایرۆس ئەم کلیلانە بەیەکەوە دابگرە لەسەر کیبۆردەکە (Alt+ctrl+Delete)پەنجەرەیەکمان بۆ دەکرێتەوە بەم شێوەیە. بەشی (processes)هەڵدەبژێرین دوای لەو بەشە هەرچی بەناوی(temp١.exe)یان(temp2.exe)یە لەکاردەوەستێنین بەدەست نیشان کردنی وەکلیك کردن لەسەر ( End




لە دوای ئەنجام دانی ئەو کارانە ئەگەر بینیت ئەو ڤایرۆسە لە ناو نەچووە ئەوە تەنها دەبێت لە ڕێگای فۆرماتەوە ئەو کارە بکەیت و ئەگەر بکرێت لە دۆسەوە فۆرماتەکە بکەیت ئەوە باشتر دەبێت بۆ لە ناو چوونی ڤایرۆسەکە و دوای ئەوەی فۆرماتیش تەواو دەکیت و سیستەم دادەمەزرێنیت هەوڵ بدە دژە ڤایرۆسێکی باش دابمەزرێنیت لەسەر سیستەمەکەت بۆ پاراستنی سیستەم و بەرنامەکانت.

**تێبینی : هەر بابەتێك بڵاو بکرێتەوە پاداشتی پێ دەدرێت .**

- هەر بابەتێك لە شوێنێك یان لە گۆڤارێکی تری کوردی بڵاو کرابێتەوە ئێمە بڵاوی ناکەینەوە .
- ئەگەر بابەتەکان نەشیا بۆ بڵاو کردنەوە ئەوا بابەتەکە ناگەڕێندرێتەوە بۆ خاوەنەکەی .
- هەر کەسێك بابەت ئەنێری بۆ بڵاو کردنەوە لە گۆڤارەکەمان با بە تەواوی باسی بابەتەکە ڕوون بکاتەوە وبە بەرنامەی Microsoft Wordبابەتەکە بنووسرێت و وێنەکانی ڕوونکەرەوە لەگەڵ هەمان بابەت بنێرێت بۆمان بەڵام با وێنەکان لە نێو فۆڵدەرێکی جیاواز بێت و لەسەر سیدی یان لەسەر فلاش میمۆری بۆمان بنێرێت.

# ئامێری بلۆتۆس

ئا: بێستون


وێنەی ١

وەك دەزانـــین ئێـــستا ئـــامێری بلۆتـــۆس ئـــامێرێكی زۆربـــاوە بەتایبـــەتی لـــەدونیای مۆبایلدا پێشكەوتنێكی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە ئامێری بلۆتۆس بەزۆری لەناو ئامێری مۆبایلەكانـــدا دروســـتكراوە بـــەڵام لەبـــەر ســـەركەوتنی و زۆربـــەكارهێنانی ئێـــستا كۆمپانیای خۆی بەتەنها وەك ئامێری فلاش میمـــۆری دروســـتی دەكـــات و دەیخاتـــە بازاڕەكانەوە ئەم ئامێرە زۆر بەسودە نەك هەر بۆ مۆبایل بەلكو بەستنەوەی دوو كۆمپیوتـەر بەیەكـــەوە و هـــەروەها گواســـتنەوەی تـــۆری ئەنتەرنێت لەمۆبایلەوە بۆكۆمپیوتـەر ئامێری بلۆتۆس ئامێرێكی سادەی پێشكەوتوە ئەم ئـامێرە بچوكەو لەشـێوەی فـلاش میمـۆری بچوكە سیدی یەكی تایبەت بەخۆی لەگەلە بەكار هێنانی بەرنامەكە زۆر ئاسانە سەرەتا دێین بەرنامەكە دادەبەزێنین لەسەر كۆمپیوتەر پاشان بەرنامەكە دەكەینەوە سەیری وێنە ١ بكە


وێنەی ٢

پاشان بەرنامەكە بەم شێوەیە دەردەكەوێت سەیری ناوەراستی بەرنامەكە بكە بازنەیەكی سوور هەیە یەكجار كلیكی لەسەر بكە پاشان لەناو مۆبایلەكەی خۆتدا بلۆتۆسەكەت بكەوە ئینجا ســەیری بەرنامەكــە بكــە دەبینیــت مۆبایلێك لەناوبەرنامەكە زیاد دەبێت وێنە ٢



وێنەی ٣

کە ژمارەی مۆدێلی مۆبایلەکەشت بۆدیاری دەکات ئەوە بریتی بوو لەبەستنەوەی مۆبایل بەکۆمپیوتەر ئێستا بابێینە سەر چۆنیەتی ناردنی شتێك لەناو مۆبایلەوە بۆ ناو کۆمپیوتەر سەرەتا ئەوشتەی لەناو مۆبایلەکەیە کە دەمانەوێ بینێرین بۆناو کۆمپیوتەر بەلای ڕاست کلیکێکی لەسەر دەکەین لەناومۆبایلەکە ئینجا SEND ی دەکەین بۆ بۆکۆمپیوتەر ئینجا لیستێك دەردەکەوێت کلیك بکە لەسەر YES وەك شێوەی وێنە ٣

ئنجا شتەکە ڕاستەوخۆ دەچێتە ناو فایلی بلۆتۆسەکە کە لەناو کۆمپیوتەرەکەدایە بەڵام ئەگەر هاتو بە پێچەوانەوە شتێکمان لەناو کۆمپیوتەرەوە نارد بۆناو مۆبایل ئەو دەبێت ئەوشتەی دەمانەوێ بینێرین بەلای ڕاست کلیکێکی لەسەر دەکەین لەپاش ئەو کلیکە لیستێك دەبێتەوە ئینجا لە ناوەڕاستی ئەو لیستە SEND TOO هەیە لە تەنیشتی SEND TOO سەهمێك هەیە ئەگەر بچینە سەر ئەو سەهمە دەبینین لیستێکی تر دەبێتەوە لەم لیستە نوێیە هێمای بلۆتۆس زیاد بوە یەك کلیکی لەسەر دەکەیت ڕاستەوخۆ فایلەکە دەگوازرێتەوە بۆناو مۆبایل بڕوانە وێنە٤

وێنەی ٤



# بەهۆی (panda 2007)
# کۆمپیوتەرەکەت بپارێزە لەهەموو ڤایرۆسێك و هاکەرێك

کۆمپیوتەر




وێنەی ١

ڕۆژانە کە لەسەر کۆمپیوتەر کاردەکەین بۆ ڕاپەراندنی کارەکانمان و بەتایبەتی ئەو کارانەی کە لەئەنتەرنێتەوە ئەنجامی دەدەین زۆر ئەگەری ئەوە هەیە کە کۆمپیوتەرەکەمان تووشی فایرۆس بێت یان تووشی دزە کردنی لایەنی تر ببین یان بۆ سیخوری کردن لەسەر کۆمپیوتەرەکانمان، ئنجا بۆ پاراستنی کۆمپیوتەرەکەمان و بۆ دوور بوون لەو کێشانە دەتوانن دژەڤایرۆسی panda بەکاربێنن کە دژی هەموو ئەو کارانەیە ، و ئەم دژەڤایرۆسە چەند تایبەتمەندیەکی تایبەتی هەیە لەوانە




وێنەی ٢

ئەگەر کۆمپیوتەرەکەت تۆشی درە کردن یان سیخوڕی کرا بێتە سەرت لە ڕێگای ئەنتەرنێتەوە ئەوا خەتی بەرامبەر دادخات و ئەگەر فایلێکی ویندۆزەکە تێك چووبێت ئەوا چاکی دەکاتەوە وەهەروەها ئەگەر ئەو ڤایرۆسانەی کە ویندۆز دەکۆژێنێتەوە و ئەوا هەموو ئەو کێشانەمان بۆ چاك دەکات




وێنەی ٣

لە دوای دامەزراندنی بەرنامەکە و سکان کردنی بەشە هاردەکان ئەو دژە ڤایرۆسە کلێشەیکمان نیشان دەدات کە چەند ڤایرۆسی گرتووەوە چەند فایلی سیتەمی چاکردووە




وێنەی ٤

**تێبینی**: ئەم دژە ڤایرۆسە بۆ هەموو سیستەمێك دەبێت وە ئەو ویندۆزانەی کە بەهۆی ڤایرۆسەوە تێك چوون ئەویش چاك دەکات .

# یاری wings of war
# فڕۆکەی جەنگی

کۆمپیوتەر

ئارەزوومەندانی یاری ئەم جارەمان باس لە فڕۆکەی جەنگی دەکەین ئەم یاریە یاریەکی ستراتیژیە بۆ جەنگ لە نێوان چەند فڕۆکەیەك لەئاسماندا ئەم یاریە بەهۆی ڕێنمایەکانەوە کار دەکات دەبێ لەهەموو هەنگاوەکاندا بەپێی نەخشەی دیاری کراو بڕۆیت بۆیە هیچ کارگرانیەك نابینرێت لەیاریەکە و لەهەر قۆناغێك تەواو بێت بەسەرکەوتوویی ئەوا فڕۆکەیەك هاوشانت دەبێت و لەپاش برینی هەر قۆناغێك ئەوا دەتوانیت بەئارەزووی خۆت شێوەی نەخشەکان بگۆڕیت . و ئەم یاریە بەم شێوەیە کاردەکات



وێنە ١

سەرتا بەکرنەوە یاریەکە لە هەنگاوی یەکەم ناوێك دەنووسین وە لەپاشان نێکست دەکەین ( وێنەی ٢ )
پاشان جۆری یاری کردن ئەگەر بمانەوێ لەگەڵ کۆمپیوتەرەکە یاری بکەین لە ڕێگای ئەنتەرنێتەوە ئەوا هێمای خوارەوە هەڵدەبژێرین وە ئەگەر بمانەوێ بەتەنیا یاری بکەین ئەوا سەروە هەڵدەبژێرین ( وێنەی ٣ )



وێنه ٢



وێنه ٣

ئەو شوێنەی کە تێیدا دەجەنگین بۆمان دیـاری دەکات لەهەنگاوی یەکەمدا پاشان دەچینە ســەر بەردەوام بوون ( وێنەی ٤ )
پاشان هاوکێشەی شەرکردن وشوێنە بنکەیی بۆ بۆردومانکردن دیاری دەکات بە ژمارە دەست پێکردن و دەچێتە ناو یاریەکە بۆ یاری کردن و خاڵە سوورەکان بۆ بۆردومانکرن وەخاڵە سەوزەکان یاریدەدەرن وە خاڵە زەردەکان زەخیرە کۆکرنەوەیە بڕوانە .
( وێنەی ٥ )



وێنه ٤



وێنه ٥

ئنجا کلیلەکانی یاریکردن لەسەر کیبۆرد لەم وێنەیەدا دیاریکراوە بەهیوای یاریەکی خۆش ( وێنەی ٦ )

BASIC ADVANCED MULTIPLAYER

| | KEYBOARD | MOUSE | JOYSTICK |
|---|---|---|---|
| Roll left | Left | | |
| Roll right | Right | | |
| Pitch up | Up | | |
| Pitch down | Down | | |
| Yaw left | Right Ctrl | | |
| Yaw right | Num 0 | | |
| Throttle up | + | N/A | N/A |
| Throttle down | - | N/A | N/A |
| Engine on/off | E | N/A | N/A |
| Fire primary | Space | Mbutt 1 | Jbutt 1 |
| Fire secondary | Enter | Mbutt 2 | Jbutt 2 |
| Photo/bomb view | B | N/A | N/A |
| Select target | Num 1 | N/A | Jbutt 6 |
| Firing post switch | Tab | N/A | N/A |
| Sec.weapon switch | L | N/A | Jbutt 3 |

BACK DEFAULT

وێنە ٦

تێبینی : ئەم یاریە لەسەر سیستەمی xp کاردەکات وە کارت شاشەی دەبێ 128 کەمتر نەبێت و ڕامی 256 بێت وە cpu 2000 کەمترنەبێت واتا پەنتیۆم چواربێت و ئەم یاریە دەتوانرێ بە دەسکی تایبەت بە کۆمپیوتەر کاربکات (جۆستیك ) .